# سەفەوییەت

## مێژوو و ململانێ و کاریگەرییەکانی دوای خۆی


نووسینی:

( د. عەلی وەردی —و— .....

وەرگێڕانی: عبدالله گەرمیانی


ٲ


چاپی یەکەم

٢٠١٩

**لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**




ناسنامەی کتێب

## مێژووی سەفەوییەت

- ❖ **نوسینی:** د. عەلی وەردی –و– ....
- ❖ **وەرگێڕانی:** عبداللە گەرمیانی
- ❖ **بابەت:** لێکۆڵینەوە
- ❖ **نەخشەسازی ناوەوە:** فواد کەولۆسی
- ❖ **دیزاینی بەرگ:** **محمد زراری**
- ❖ **نۆبەتی چاپ:** چاپی یەکەم
- ❖ **ساڵی چاپ:** ٢٠١٩
- ❖ **شوێنی چاپ:** چاپخانەی گەنج
- ❖ **تیراژ:** ١٠٠٠

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن: ( ٢٧١٦ )ی ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە.**

---

**ناونیشان**

**سلێمانی ـ سابوونکەران ـ نێوان گەراجی عوسمانی تەمین و شوقەکانی تەکیە رووتە.**

**ژمارەی مۆبایل:** (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێرست



## دەوڵەتی سەفەوییەت و شیعەگەری



## هۆکارو پاڵنەرەکانی دروستبوونی دەوڵەتی سەفەوییەت

## سەفەوییەت و عوسمانی... شەڕی ئایدیۆلۆجیای تایەفی



## دەوڵەتی سەفەوییەت و شوێنکەوتەکانی ئایین و مەزهەبەکانی تر

## دیمەنی سۆفیگەری و فەلسەفیی لەسەردەمی سەفەویدا

## زانست و هونەرو وێژەکان لەسەردەمی سەفەوییەتدا



## بنەماڵەی سەفەوییەت، شێخ و پادشاکانی

# پێشەکی وەرگێڕ

بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

ئەم کتێبە کۆمەڵە بابەتێکە لەنووسینی کۆمەڵە نووسەرێکی شیعە مەزهەب و هەڵگری پاشخانی فیکری شیعە، ئەگەرچی د. عەلی وەردی وەها دادەنرێت کاریگەریی ئەو مەزهەبەی لەسەر نییە، بەلاّم لەڕووی تێڕوانین و ڕەخنەیەوە قسەکانی دژە سووننەن زیاتر لەوەی ئاراستەی شیعە بێ، نووسینەکانی لەبواری کۆمەڵناسیدایە، بەلاّم نووسەرەکانی تر سەربارێ لێکۆڵەربوونی هەندێکیان، ئەوە هەندێکیان مامۆستاو وانەبێژی حەوزە زانستیی و قوتابخانە زانستییەکانی شیعەن، لەم کتێبە قەبارە مامناوەندییەدا تەواوی سەربووردەو مێژووی بنەماڵەی سەفەوییەت بەسەردەمی تەریقەت بوون و پاشان دەوڵەتدارێتی و ماوەو ژیانی شاکانی ئەم بنەماڵەیە شارەزا دەبین، ئەو زانا شیعەییانەش کە بوونە قۆڵەکەی فیکری و پشتگیرییەکی باشی سەقامگیربوونی دەوڵەتی سەفەوی.

لەم کتێبەدا ئاشنا دەبین بەسەرچاوەی نەریتە ئایینییەکانی شیعە کە لەم سەردەمەدا برەوێکی زۆریان هەیە لای خەڵکانی شیعە

مەزهـــەب، لەیادکردنـــەوەی عاشـــووراو ســـەردانیکردنی گـــۆڕی ئیمامـەکانیان، لـەوەش گرنگتر شـۆڕبوونەوە بـۆ شـەڕی مەزهـەبیی نێوان شـیعەو سـوونەی ئـەوکات کـە خـۆی لەدەوڵـەتی سـەفەوی و عوسمانیدا بینیووەتـەوەو رەنگدانەوەکەشـی لەئـەمڕۆدا، دیـارە ئـەو کێشـەیە کـە هـی سـەردەمانی پێشـتر بـووە، رەنگدانـەوەی تـاڵتری هەبووە لەسـەردەمی عەباسـییەکان و ئـەوترێت کـە بـەهۆی کێشـەی شیعەو سـوونەوە شـیعەکانی بەغـدا لەگـەڵ مەغۆلـدا هاودەسـتییان کـردووەو خیلافـەتی عەباسـیی رووخـاوە، ئـەم هاودەسـتی کردنـە لەمێـژوودا زۆر دەبیـنین، لەسـەردەمی دەرکـەوتنی سـەفەوییەتدا جارێکی تر ئەمە دووبارە دەبێتەوە، جا لەم کتێبەدا کە بەپێنووسـی خەڵکانی هەڵگری بیری شیعە نووسراون ئەوانەمان بەرچاو دەکـەوێ، ئەگەرچـیش بـۆ ئـەو کـارە بیانوویـان هێناوەتەوە! دەرهاوێشـتەی شەڕەکانیش لەسەر نەتەوەی کورد و مامەڵەی سەفەوییەکان لەگـەڵ کورد و کاری راگواستنیان.

هـــەروەها ئامـــاژە کراوەتـــە گـــرنگترین فەیلەســـوفانی ســـەردەمی ســـەفەوییەت و بەباســـکردنی هەنـــدێ بۆچـــوونیان، کـــە لەئێســـتادا رەنگدانەوەی هەیە، منـیش وەك خـۆی وەرمگێـڕاوە، تـەنیا لەچـەند شوێنێکدا روونکردنەوەم داوە، بەتایبەت ئەو چەند بڕگانـەی لـەبیر و باوەڕی ئەوان لەم کتێبەدا باسکراوە چەندان لاپـەڕەی شـیکردنەوەی دەوێ، وەك خودی وەرگێڕ لەبوونی بیروبـاوەڕێکی پـوختی پێشـینی

چاك پێویستم بەگەڕانی فەلسەفی و کەلام نییە بۆ خوا ناسین، ئەوەشی لەم کتێبەدا دەبینرێ لەبیروباوەڕی سەیر، من خاوەنی نیم، ئەمانەتێکی زانستییەو پێیەوەی پابەندم.
بەهیوام وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەرهەمی وەرگێڕانی نێو کتێبخانەی کوردیی دەوڵەمەندتر بکات و سوودی زۆری هەبێ لەشارەزابوونمان بەمێژووی ئەو دەوڵەتە.

عبدالله فازڵ حەسەن(گەرمیانی)١٠/ ٩/ ٢٠١٦
بۆ گەیاندنی سەرنج و تێبینی بەوەرگێڕ:
abdulaemail@yahoo.com

# پێشەکی

سەرەتا شتێکی باشە بڵێین، سەفەوییەت کە بۆ چەند سەدەیەك بەجەنگ و ململانێکانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا ناوچەکەی سەرقاڵ کردبوو، بەنمونەی دەوڵەتی عوسمانیش لەئێستادا تەنیا باس و بابەتێکی مێژووە، بەڵام ئەو کەسەی بەدواداچوونی ناکۆکی و ململانێی مەزهەبیی نێوان سوننە و شیعە دەکات، دەبینێ ناکۆکییەکان پەیوەندییان بەمیراتی ئەو دوو دەوڵەتەو مومارەسە مەزهەبییەکانی پێشوویانەوە هەیە، کە لەپێناو کۆکردنەوەی شوێنکەوتە لەپشت شاو سوڵتانەکانەوە مومارەسەی ناکۆکییە مەزهەبییەکانیان ئەکرد.

هەر ئەوەش پاڵنەرمان بوو بۆ رۆچوونە مێژووی وردو درشتی دەوڵەتی سەفەوییەت، سەرەتا لەهۆکارەکانی دروستبوونی و گەیشتە لوتکەی لەڕووی سیاسییەوەو ئەو جەنگ کاڵەی نێوان خۆی و دەوڵەتی عوسمانیش کە هەزاران کەسی ئایین و نەتەوە جیاوازی ناوچەکەی کردە سووتەمەنیی شەڕەکانیان.

خوێنەری ناپسپۆڕی مێژووی سەفەوییەت، لەڕووی پیت و بێژەی سەفەوییەت و سۆفییەتەوە هاوشێوەیی لێ تێکەڵ ئەبێ، پاشان پلەبەندی و تێکەڵیی مێژوویی نێوان ئەو دوو وشەیە، زاڵبوونی شێخ یان شاکان و دڵڕەقی و سەرکردایەتییان بۆ سوپاکان، لەو جۆرە خوێنەرانەی دوور دەخاتەوە کە ئەوانە لەسەرەتادا هەڵگری تەریقەت و تایەفەیەکی سۆفیی بوونە، لەوەی سۆفییەت لەخۆی دەنوێنێ بەملکەچبوون بۆ قەدەرو پڕ بوونی دڵ بەخۆشەویستیی خوایی، بەڵام لەڕاستیدا سەفەوییەت لەڕەحمێکی سۆفییانەوە دروستبوو، نازناوی ئەلصەفیی باپیرەی بنەماڵەی سەفەوییەت گۆڕا بۆ تەریقەتێك بەسەفەوییەت ناسرا، پاشان بۆ دەوڵەتی سەفەوییەت، ناوی دەوڵەتی سەفەوییەت بەسەر تەریقەتی سەفەوییەتدا زاڵ بوو، تەنیا لەڕووی مێژووەوە ناوی مایەوە، لەم کتێبەشدا شیکردنەوەیەکی تەواو هەیە لەبارەی ئەو گۆڕانکارییەوە.

دوای لێبوونەوە لەخوێندنەوەی ئەم کتێبە، خوێنەر سەرسام دەبێت بەو زیادەڕۆیی و توندڕەوییە مەزهەبییەی کە لەبەر هۆکار گەلێکی سیاسیی روویداوە، بەجۆرێك سوڵتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی، فەرمانی داوە بۆ کوشتنیان شیعەکان سەرژمێریی بکەن و مەزهەبی حەنەفییەت تاکە مەزهەبی فەرمیی دەوڵەت بێ، لەلایەن خۆیشییەوە شا عەباسی یەکەمی سەفەوی، لەداگیرکردنی بەغدا لەسەدەی شانزەی زایین/دەی کۆچی، فەرمانی داوە پاکتاوی ئەهلی سووننە

بکرێ و گۆڕی زاناو پێشەواکانیان لەبەغدا وێران بکرێ و دەمارگیری شیعەگەریی راگەیاند و شتی وەهای داهێنا لەمەزهەبی شیعەدا بوونی نەبوو لەکردنی هەندێ کاردا کە بۆ سوڵتان بەسوودو بۆ مەزهەبی شیعە زیانبەخش بوو: رایگەیاند کە دەبێ جنێو بەسێ خەلیفەکە بدرێت(ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان)، وتنی(أشهد أن عليا ولي الله) لەبانگدا کە لەبناغەدا لەبانگدانی لای شیعە نەبوو، زیادکردنی هەندێ ئەفسانەو شتی بێ بنەما بۆ پاڵ تەعزێبارییکردن بۆ حوسێن لەسرووتی عاشورادا.

جگە یەك لێکۆڵینەوەی زانا عەلی وەردی، دەنا هەموو لێکۆڵینەوەکانی تر سەرچاوەی فارسیی رەسەنن، رەنگە یەکەمین جاریش بێ لەلێکۆڵینەوە گەلێکی عەرەبییدا شوێن و رێگەی خۆیانیان کردبێتەوە.

سەنتەری(المسبار) کتێبی"سەفەوییەت: مێژوو ململانێ و کاریگەرییەکانی دوای خۆی" پێشکەش دەکات تاوەکو لەکتێبخانەی عەرەبیماندا کەلێنێك پڕ بکاتەوە، کە لەو کتێبخانەیەدا گرنگییەکی گەورە بەدەوڵەتی سەفەوییەت نەدراوە، سەرباری گرنگیی ئەو دەوڵەتە لەڕووی ئەو چەندین سەدەیەی پەلکێشا بوو بۆ سنوورەکانی ناوچەی عەرەب و بەزاندنیشی لەهەندێ قۆناغدا، لەململانێیەکی تاڵی مەزهەبی و سیاسیدا چووە رکەبەرێتیی دەوڵەتی عوسمانییەوە، جا بۆیە دووبارە خوێندنەوەی ئەو قۆناغە، زۆرێك لەو

رووداوانـــه شـــی دەبێتـــەوە کـــە رووداوەکـــان ســـەخت و تونـــدو دەمارگیرانەتر ئەکەن لەمڕۆی ناوچەکەماندا.

تركي الدخيل

عبدالله بن بجاد

# پیشەکی

نووسین لەبارەی سەفەوییەتەوە بەبێ هیچ پاشخانێکی مەزهەبی دکتۆر عەلی وەردی(کۆچکردووی١٩٩٥ز) بەدیارترین لێکۆڵەرو زانا عێراقییەکانی بواری کۆمەڵناسیی دادەنرێ، بەڵکو بەیەکێك لەزانا هەڵکەوتەکانی ئەو بوارە لەهەموو ناوچەکەدا، راستە کە زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی خستنەبەرباسی دیاردەو رواڵەتەکانی کۆمەڵگەی عێراقە، بەڵام ئامادەییشی لەوڵاتانی تردا کەم نییە.

وەردی لەشوێنێکی ئایینیدا پێگەیشت، لەشوێنی پیرۆزی کازمییەکاندا، ئەو ژینگەیەش یارمەتیدەری دروستبوون و پەیڕەوکردنی هەستە ئایینییەکانە، بەتایبەتیش هەستی مەزهەب گەرایی، لەنێو بازاڕدا چاوی بەرووی ژیاندا کردەوەو لەدوکانێکدا وەك فرۆشیار کاری دەکرد، دیارە بازاڕی شاری کازمییە یەکێکە لەبازاڕەکانی شارەکانی دەورووبەری بەغداو قەرەباڵغە بەگەل و رۆشنبیریی جیاوازی شیعە مەزهەبی ئێران و هیندو پاکستان و بەحرەین و لوبنان و ناوچەکانی تر، دواتریش هەموو ئەوانە دەبنە

بەڵگــــەو دیکـــۆمێنتی بـــیری ئـــەو و دەیانپـــارێزێ تــــاوەکو لەلێکۆڵینەوەکانیــدا ئـــەو دیاردانـــە وەك شـــایەتحاڵێکی زینـــدوو بخاتەبەرباس.

وەردی لەکازمییەدا بەخوێندنی فەقێیەتی(المَلالي) دەستی کـردە خوێنـدن کـە جـارێ خوێنـدنی خوێنـدنگا نوێیـەکان دەرنەکـەوتبوو، بواری بۆ هاتەپێش خوێندنی زانکۆیی لـەزانکۆی ئـەمریکی لەبـەیروت تەواو بکات، پاشان خوێندنی باڵا بەهەردوو قۆناغەکەیەوە لـەزانکۆی تکسـاس لەوڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لـەبواری کۆمەڵناسـیدا، لەسـاڵی تـەواوکردنی خوێنـدنی لەسـاڵی١٩٥٠ەوە تـاوەکو سـاڵی خانەنشین بوونی لەساڵی١٩٧٠ز، مامۆستاو مامۆستای راهێنراو بووە لەزانکۆی بەغدا، لـەو ماوەیـەدا ئەوانـەی نووسـیوەتەوە کـە بووەتـە جێی توورەیی پیاوانی ئاین و ئەو موحافیزکارانـەی رەخنـەیان لێـی هەبووە، بەتایبەت لەبەرانبـەر کتێبەکەیـدا(وعـاظ السـلاطین)(١٩٥٤)، لەسەر لاپـەڕەکانی رۆژنامەکانی ئەوکات مشتومڕی نێوانیان بەردەوام بوو، زانایەکی ئایینی شیعە مەزهەب کە سەید مورتـەزا ئەلعەسکەریی بـوو(ك٢٠٠٧) لەوەلامیـدا کتێبێکـی نووسـییەوە بەناونیشـانی(مـع الدکتور علـي الـوردي– لەگـەڵ دکتـۆر عـەلی وەردیـدا)(١٩٥٥) و لـەو کتێبـەدا ئامـاژەی بـەوە دا، کـە وەردی دەیـەوێ ئـەدەب و ئـەخلاق لەنێو ببات و باسە ئایینییە نەگۆڕەکانی بەزاندوە.

وەردیی راپەڕیوو بەزمانی نەحوی تەقلیدیی نەیدەنووسی، بۆیە لەو بوارەدا نووسەرو لێکۆڵەران بەتووڕەییەوە تۆمەتباریان ئەکرد کە عەرەبیی نازانێ، بەڵام ئەو دەیەویست لەجڵەوی نەحو رزگاری بێ، دواتر لێکۆڵەری عێراقی هادی ئەلعەلەوی(ک١٩٩٥) شوێن پێی ئەوی هەڵگرت، تائەوەی گۆڤارەکان لەپێشەکیی بابەتەکانیدا ئاماژەیان بەبۆچوون و شێوازی نووسینی ئەو دەدا، تاوەکو بەزمان لاواز تۆمەتباری نەکەن.

پێش کتێبی(الوعاظ) ، کتێبی(خواطر اللاشعور-١٩٥٢)ی هەبوو، لەپێش ئەو دوو کتێبەش وتارێکی هەبوو بەناونیشانی(شخصية الفرد العراقي)(١٩٥١) لەبەغدا، لەنامیلکەیەکدا بڵاوی کردەوەو دوولایەنی(دووفاقی) تاکی عێراقیی دەرخست، کە لەڕووی تایبەتمەندێتییەوە لەکەسێتیە عەرەبی و رۆژهەڵاتییەکانەوە دوور نییە لەڕووی تێکەڵبووی نا سەرکەوتووی نێوان دەشتنشین و شارنشینیدا.

هەروەها(مهزلة العقل البشري)(١٩٥٥)ی هەیە، دوای ئەوەش(أسطورة الأدب الرفيع)(١٩٥٧) و (الأحلام بين العلم والعقيدة)(١٩٥٩) و (منطق ابن خلدون في ضوء حضارته وشخصيته)(١٩٦٢) و (دراسة في طبيعة المجتمع العراقي)(١٩٦٥). دەیەی پەنجاو شەستەکان لوتکەی چالاکی و زانیارییەکانی ئەم لێکۆڵەرەمان بوو.

بەلاّم گرنگترینی کتێبـەکانی کـە بـەپرۆژەی تەمـەن وەسـفکراوە، کتێبی(لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث)ە(١٩٦٩- ١٩٧٩)، دە ساڵ پێوەی سەرقاڵ بووەو بـەدوای یـەك لەشـەش بەشـدا بـلاّوی کردووەتـــەوە، بەشـــی پێـــنج و شـــەش لەچـوار بەش(قســـم) بـلاّوی کردووەتەوە.

لـەو کتێبـەدا بـەدیاردەی کۆمەلاّیـەتیی عێـراق دەسـتیپێکردووە لەململانێی عوسمانیی ئێرانییەوە، بەشی شەشەمی تایبـەت کـردووە بەدامەزراندنی پادشانشینی عەرەبی سعودو ئەوەی تایبـەت بـیَ بـەو لێکۆڵینەوەیەوە، لەبەشی یەکەمدا قسەی کردووە لەسەر دەرکەوتنی شیعەگەریی سەفەوییەت و ئەوەی هێنایـە نێـو شـیعەگەرییەوە، ئـەو بابەتەیە کە دوای ئەم پێشەکیە خوێنەر پێی دەگات.

لـــەم بەشـــەی کـــە لەبەردەســـتمانە(دەوڵەتی ســـەفەوییەت و شـــیعەگەری)، بـــوێریی و زانســـتێتیی لێکۆڵـــەر دەبیـــنین کـــە هـــیچ پاشخانێك کاری تیَ نەکردووە.

عەلی وەردی لەژینگەیەکدا پێگەیشت کە سـەفەوییەکان شـیعەیان بەســـەردا ســـەپاندبوو، بـــۆ ســـالآنێك بـــەپێی بانگـدانی ســـەفەوییەت گوێبیستی بانگ بووەو هەموو شوێنەوارەکانی ئەو ماوەیـەی بەغـداو بەتایبەت شاری کازمییە شیعە مەزهەب کە بۆ چەند دەیەیەك عێـراق لەژێر دەسەلاّتی سەفەویەتدا بووەو هەموو ئـەو کاریگەرییانـەی تێـدا ماوەتەوە.

بەگشــتی، شــێوازی نووســینی عــەلی وەردی بــەڕوون و ڕەوان دادەنرێ، زۆرترین نووسەرێکە کتێبـەکانی دەخوێندرێتـەوە، چـونکە تەواوی ئاستە جیاوازەکـان کتێبـەکانی دەخوێننـەوەو لێکۆڵینـەوەی هەموو ئاستەکانە، تایبەتمەندە بەهەمەجۆریی سەرچاوەکان لـەڕووی کتێب و دیکۆمێنتی سەرشەقام و قاوەخانەکان و بازاڕەوە، بەڵام ئەو عەیبەی کە لەسەری دەگیرێ و کەمێك لەلێکۆڵەران دەیبینن ئەوەیە، بــەبێ وردبوونــەوە لەلێکۆڵینــەوە کۆمەڵناســییەکانیدا پشــتی بەگێڕانەوە مێژووییەکان بەستووەو وردبوونـەوەو لێکۆڵینـەوەی ئـەو گێڕانەوانانـەی نـەکردووەو لەشیکردنەوە کۆمەڵایەتییەکانیـدا لـەنێو مێـژوودا هــەڵهێنجانی کـردووە، بۆیــە خــەڵکانێك بەمێژوونووســیان داناوەو ئەوەش نییـە. ڕەنگـە ئەگـەر پرسیاری ئـەوەی لـێ بکرایـە، لەوەڵامدا بیوتبایە نەپسپۆڕی مێژووەو نە لێکۆڵەری مێژووییش.

زۆرجار وەردیـی گێڕانەوەکـە دەخاتـە ئەسـتۆی مێـژوونووس بـێ ئـەوەی بـەراوردو پشـکنینی بـۆ بکـات، بـۆ نمونـە لەڕێگـەی ئـەو و لێکۆڵەر گەلێکی تر کە شوێنی ئەو کەوتوون، بـەربلاو بووەتـەوە کـە هۆکاری بڵاوبوونەوەی مەزهەبی حەنەفیی لەسەردەمی عوسمانیدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، ئەبی حەنیفە(کۆچکردووی١٥٠ك) ڕێگـەی داوەو و پێـی ئاسـایی بـووە پێشـەوایەتیکردن لەغـەیرە قوریشـیش بـێ، عوسمانییــەکان لەبــەر ئــەم هۆکــارە مەزهــەبی حەنــەفیان

بڵاوکردووەتەوە، بەڵام حەقیقەت شتێکی ترە، ئەویش ئەوەیە کە عوسمانییەکان لەپێش خیلافەتەکەشیاندا حەنەفیی مەزهەب بوونە.

بەڵام ئەوە لەپلەو پایەی دکتۆر عەلی وەردیی زانای کۆمەڵناس کەمناکاتەوە، کە لەنووسینەکانیدا هیچ هەست و سۆزو ئایین و نەتەوەیەك شوێنەواری نییە و لەوانە داماڵراوە، بەوە نووسینەکەی لەبارەی سەفەوییەتەوە تەنیا بەمەبەستی دەرخستنی حەقیقەت بووە، هەرچی خراپی هەبووبێ وتوویەتی و باشەکانیشی باس کردووە، بەبێ رووپامایی و مەرایی کردن بۆ ئایین و مەزهەبی خۆی و گوێدانە هیچ تانەو تۆمەتێك، هەروەك لەخوێندنەوەی لاپەڕەکانی دواتردا ئەوە تێبینیی ئەکەین.

لەکۆتایی ئەم پێشەکییەدا ئاماژە ئەدەینە ئەوەی، لەپەراوێزەکاندا نیشانەی(*) روونکردنەوەی سەنتەری بڵاوکارە، پەراوێزی تەنیا ژمارەش دەقە بنەڕەتییەکەیە.

بێگومان دەرکەوتنی دەوڵەتی سەفەوییەت لەئێراندا کاریگەریی زۆری هەبووە لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینییەوە، ئەو کاریگەرییانەش تەنیا لەسەر ئێران کورت نەهاتووەتەوە، بەڵکو پەلیکێشاوە بۆ عێراق و تورکیاو ئەفغانستان و هیند، ئێمەش ناتوانین بەتێگەیشتنێکی قووڵ لەمێژووی عێراق و سرووشتی کۆمەڵگکەی تێبگەین تاوەکو بەتەواوی و وردبوونەوەوە دەوڵەتی سەفەوییەت لێکۆڵینەوە نەکەین، جا بۆیە لەم بەشەدا هەوڵ دەدەم

لایەنێکی دەوڵەتی سەفەوییەت لێکۆڵینەوە بکەم کە پەیوەندییەکی تووندوتۆڵی بەکۆمەڵگەی عێراقییەوە هەیە، ئەویش لایەنی مەزهەبییە، کە جێی داخە سەرەڕای گرنگییە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکەی، لەلایەن لێکۆڵەرانەوە گرنگییەکی تەواوی وەرنەگرتووە.

## دامەزرێنەری دەوڵەتەکە

دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوی، (شا ئیسماعیل)ە، کە بەزۆر مەزهەبی دوانزە ئیمامی شیعەی سەپاندە سەر ئێرانییەکان و کردیە مەزهەبی فەرمیی حکومەتی ئێران، مامۆستا براون* وەسفێکی جوانی بەکەسێتیی ئەو پیاوە داوە، وەسفەکەی لەو گەڕیدەو بازرگانە ئەورووپییانەوە گواستووەتەوە کە شا ئیسماعیلیان بینیووەو بەپێی قسەی ئەوان زۆرێک شتی دژی لەخۆیدا کۆکردبووەوە، لەلایەکەوە دڵڕەق و تینووی خوێنڕێژیی بووە تا ئاستێك کە بەڕاست نەزانرێ، لەلایەکی تریشەوە کەشخەو ئەخلاق

---

* - ئیدوارد براون: ڕۆژهەلاتناس و مێژوونووس و پزیشکی ئینگلیزی، لەستوت هیل لەساڵی١٨٦٢ز لەدایکبووە، کوڕی ڕۆژهەلاتناسی بەناوبانگ (جیب)ە، مامۆستا بووە لەکامبردج و زۆرێك لێکۆڵینەوەو کتێبی هەیە لەبارەی مێژووی ئیسلامیی لەفارس و ئێران، دامەزرێنەری کۆلێژی لێکۆڵینەوە ڕۆژهەلاتییەکانە لەکامبردج، لەتورکیاو ئێراندا ژیاوە، دانراوی بەزمانی فارسی هەیەو بەناوبانگ بووە بەیەکلاکردنەوەو سەلماندنی مێژووی هەردوو بزووتنەوەی بابی و بەهایی، ساڵی١٩٢٦ مردووە، بۆ زیاتر شارەزابوون بڕوانە: نجیب العقیقي، مؤسسة المستشرقین، بڕوانە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد:
Oxford Dictionary of National Biography, Oxford University Press.٢٠٠٤

بەرزو لەلایەن سەربازەکانییەوە تا ئاستی پەرستن خۆشەویست بووە، بەبێ قەڵغان خۆیان فڕێ داوەتە گۆڕەپانی شەڕەوەو باوەڕیان بەوە هەبووە لەکاتی شەڕدا لەمەترسیی دەیانپارێزێت[1].

ئەو خەیاڵە ئەکەم کە شا ئیسماعیل لەو پیاوانە بووە کە بەهرە گەلێکی دەگمەنیان هەبووە(خاڵی سیلبی و ئیجابیان پێکەوە کۆکردووەتەوە)و باوەڕیان وەهابووە کە قەدەر ئەوانی بۆ ئەرکێك رەخساندووە، ئەوکاتەی کە هەستا بەسەپاندنی شیعەگەریی بەسەر ئێرانییەکاندا، دڵنیابوو کە لەلایەن روحێکی بەهێزی بالآوە بۆ ئەو کارە ئەرکدار کراوە.

بەهەرحاڵ، باوەڕی وەهابووە غەیبییانە پاڵدەدرێ و رێنیشاندەریی ئەکرێ لەکارەکانیدا، نابێ ئەوەشمان لەبیربچێ کە پیاوێکی سۆفیی بووە، یەکێك لەکاری سۆفییەکانیش باوەڕبوونیانە بەئیلهامی غەیبی، ئەوەش دەزانرێ کە بەموریدەکانی وتووە بەفەرمانی دوانزە ئیمامەکە دەجوڵێتەوەو مەعسومە(لەتاوان پارێزراوە) و لەنێوان خۆی و مەهدیدا هیچ دابڕانێك بوونی نییە[2].

رەنگە لەڕاستیی لانەدەم ئەگەر بڵێم، تەواوی ئەو شتانەی ئیسماعیل خستیە نێو شیعەی ئێرانەوە، لەو بیرە سۆفییانەی

---

[1] - Edward Browne, A Literary History of Persia,Cambridge١٩٥٣.vol.٤.p٢٢- ٢٣

[2] – كامل مصطفى الشيبي، الفكر الشيعي والنزعات الصوفية حتى مطلع القرن الثاني عشر الهجري، بغداد ١٩٦٦، ص٤١٣.

خۆیەوە سەرچاوەی گرتبوو کە هەیبووە، چونکە لەتوانای کەسدا نەبووە بەیەکجار ئەو شتانە بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ ئەگەر(کەشف) و ئیلهامیی روحیی نەبووبێ.

لەبارەی شا ئیسماعیلەوە دەگێڕدرێتەوە، کاتێك لەسەرەتای دەسەلاتیدا تەبریزی فەتح کردو ویستی بەزەبری هێز مەزهەبی شیعە بەسەر خەڵکەکەیدا بسەپێنێ، هەندێ راوێژکاری کە پیاوانی ئایینیی بوون ئامۆژگارییان کرد ئەو کارە نەکات، بەبیانووی ئەوەی دوو لەسەر سێی شارەکە ئەهلی سووننەن و ئارام ناگرن لەسەر مینبەرەکانەوە جنێو بەو سێ خەلیفەیە بدرێت، بەلاَم وەلاَمی دانەوە: "من بەو کارە ئەرکم خراوەتەسەرو خواو پێشەوا مەعسومەکان لەگەڵمدان و لەهیچ کەسێك ناترسم، ئەگەر لەو خەڵکە نارەزایی ببینم، بەهاوکاریی خوا شمشێریان بۆ هەڵدەکێشم و کەسیان بەزیندوو ناهێڵمەوە"[1].

ئەتوانین بلێین کە شا ئیسماعیل ویستی سوود بەشیعە بگەیەنێ کەچیی خراپەی بەرانبەر کرد، یان لەیەك کاتدا سوودو زیانی پێگەیاند، لەرووییەکەوە ژمارەی شیعەکانی زۆر کردەوە کاتێك زۆرێکی ئێرانییەکانی کردە شیعە، بەلاَم لەروویەکی ترەوە شت گەلێکی تێکەڵ بەشیعەگەریی کرد زیانی لێ داو ناوبانگیی

---

[1] - Edward Browne,op.cit.vol٤.p٥٣- ٥٤

مەزهەبەکەی ناشیرین کرد، شیعەی کردە مەزهەبێکی حکومیی و بەوەش بیری میللیی کۆنی خۆی تێدا زیاترو گەورەتر کردەوە.

## ئامرازەكانی بڵاوكردنەوەی مەزهەبی شیعە

شا ئیسماعیل، جنێودانە سێ خەلیفەكەی كردە ئامرازی تاقیكردنەوەی ئێرانییەكان، هەر ئێرانییەك گوێی لەجنێودان بوایە دەبوو بەدەنگی بەرز بیوتبایە"بیش باد كم ما باد"، ئەم دەستەواژەیە بەزمانی ئازەربێجانیی ئەوەی دەگەیاند، كەسی بیسەر لەگەڵ جنێوەكە یەكدەنگەو داوای جنێوی زیاتر ئەكات، ئەگەر ئەو دەستەواژەیەی نەوتبایە یەكسەر لەگەردنی دەدرا.

شا ئیسماعیل فەرمانی دا لەشەقام و بازاڕو مینبەرەكاندا جنێودان رابگەینرێت و بەرهەڵستكارانیش وریا بكرێنەوە كە لەگەردنیان دەدرێ.

لەم بارەیەوە چیرۆكێكی سەیر دەگێڕدرێتەوە كە لەهەندێ رووەوە هاوشێوەی گالیلۆیە كە پەلكێشی دادگا دەكرێت لەئیتاڵیادا تەنیا بەهۆی قسەكردنی بەوەی زەویی بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوەو كاتێك لەئەشكەنجە رزگاریی بوو كە لەوە پەشیمان بوویەوە، ئەوەش بەرانبەر یەكێك لەزانا ناسراوەكانی مەزهەبی

سووننه کرا، ئەویش(شمس الدين الخفري) بوو، لەشیرازدا بوو کاتێك شا ئیسماعیل هات بۆ ئەو شارە، کاتێك هێنرایە بەردەم شا ئیسماعیل بۆ تاقیکردنەوەی جنێودانە سێ خەلیفەکە، ئەویش بەجنێوێکی پیس لەسەربڕین خۆی رزگارکرد.

کە لای شا دەرچوو هاورێ و خوێندکارەکانی سەرزەنشتیان کردو وتیان:"چۆن لەئایینی خۆت هەڵگەڕایتەوەو نەفرەتی ئەو سێ پێشەوایەی خۆتت کرد؟! ئەویش وەڵامیانی دایەوە: ئەتانەوێ بەو فەزڵ و کەماڵەی کە هەمە لەبەر ئەو سێ عەرەبە دەشتەکییە بکوژرێم؟![1].

شا ئیسماعیل بۆ بڵاوکردنەوەی شیعە تەنیا ئامرازی ترس و تۆقاندنی نەگرتەبەر، بەڵکو ئامرازی تریشی وەرگرت، ئەویش ئامرازی پڕوپاگەندەو قایلکردنی دەروونیانە بوو، فەرمانی دا مەراسیم سازبدرێ بۆ یادی کوژرانی حوسێن بەو جۆرەی کە ئێستا هەیە[2]، ئەم مەراسیمە بوەیهییەکان لەسەدەی چواری کۆچیی لەبەغدا دەستیان پێکرد، بەڵام دوای ئەوان لەبیرکراو کەم بوویەوە. پاشان شا ئیسماعیل هات و پەرەی پێداو دانیشتنی تەعزێباریشی

[1] – كامل مصطفى الشيبي، التقية، مجلة الإيمان في عددها الخامس والسادس من السنة الثانية١٩٦٥، ص٦٠.

[2] – كامل مصطفى الشيبي: الفكر الشيعي، ص٤١٥.

بۆ زیادکرد[1] و کردیە هێزی کاریگەر لەدڵەکاندا. راستە گەر بووترێت گرنگترین هۆکارێکی بڵاوبوونەوەی شیعەگەریی لەئێراندا دانیشتنی تەعزێباریی بووە، چونکە رواڵەتی خەفەت و گریان و زۆریی ئالآ و تەپڵ لێدانی تێدایەو وەها ئەکات ئەو بیروباوەڕە بچێتە قووڵایی دەروونەکان و بیانجوڵێنێ[2].

شا ئیسماعیل فەرمانی دا شایەتیدانی سێیەم تێکەڵ بەبانگدان بکرێ، واتا وتنی(أشهد أن علياً ولي الله)، ئەم شایەتیدانە هەندێ لەڕێ دەرچوو لەسەدەی سێی کۆچیی تێکەڵی بانگیان کرد، بەلآم شیعەی میانڕەو لەکاتی خۆیدا رەتیان کردەوەو قبوڵیان نەکرد، بەلآم شا ئیسماعیل سەپاندی و گوێی لەکەس نەگرت و تاوەکو ئێستاش لەلایەن شیعەوە قسە لەسەر قبوڵ کردن و قبوڵ نەکردنی دەکرێتەوە.

---

[1] - ئەو پرسەو تەعزێبارییەی ئێستا لەکەربەلادا بە(الشبية)دەناسرێ لەسەردەمی سەفەویەتدا دروست نەبووە، بەڵکو لەسەردەمی قاجاریدا دروست بووە.

[2] - سەبارەت بەو بابەتەی تایبەت بەعێراق بێ، بڕوانە کتێبی: دراسة في طبيعة المجتمع العراقي. بغداد١٩٦٥، الفصل التاسع.

# شێخ عەلیی کەرکی

شا ئیسماعیل لەساڵی١٥٢٤ مردو تەمەنی سی و هەشت ساڵەی تەواو نەکردبوو، تەهماسبی کوڕی چووەسەر تەختی دەسەلآت، کەسێتییەکی زۆر جیاوازی لەکەسێتیی باوکیی هەبوو، بەحازریی چووە شوێنەکەی باوکی، شا ئیسماعیلی باوکی دامەزرێنەری دەوڵەتەکەو فەرماندەی سوپاکان بوو، متمانەی تەواوی هەبوو کە سەرۆکی ئایینەکەو دەوڵەتەکەشە پێکەوە، بۆیە پێویستی بەهیچ کەسێك نییە لەئایین و دونیایدا رێنیشاندەریی بکات.

کە تەهماسب فەرمانڕەوایی وەرگرت زانیی ناتوانێ وەك باوکی لەیەك کاتدا سەرۆکی ئایین و دەوڵەتیش بێ. دکتۆر کامیل ئەلشەیبیی ئەڵێ: شا تەهماسب وەهای بینی کە دانابیە کاروباری شیعەگەرێتیی بۆ شەرعناسە پسپۆڕەکان بەجێبهێڵرێت، بۆیە بانگی شێخ عەلیی کەرکیی کرد تاوەکو بەو ئەرکە هەڵبستی[1].

---

[1] - کامل مصطفى الشيبي، الفكر الشيعي، ص٤١٦.

شێخ عەلیی ئەلکەرکی دەدرێتەوە پاڵ دێی(کرک نوح) کە یەکێکە لەدێهاتەکانی بەعلەبەك، شا کاتێك بانگیکرد لەنەجەف دادەنیشت، کە گەیشتە ئێران شا پێشوازییەکی بێ وێنەی کرد، پاشان فەرمانێکی دەرکرد بۆ تەواوی پادشانشین و تیایدا باسی لەشێخ عەلیی کرد بەوەی خاوەنی راستەقینەی دەوڵەتە، بەوپێیەی جێگرو نوێنەری پێشەوای نادیارە(ساحیب زەمان) و دەبێ هەموو لایەك بەگوێی بکەن،"ئەوەی شێخ لەکاری بخات بەکارناخرێتەوەو ئەوەی ئەو پۆست و پلەی پێ دابێ لەکارناخرێت"، زۆرێك پلەوپایەی گەورەی پێ بەخشی و دێهات گەلێکی کشتوکاڵیشیی پێ بەخشی تاوەکو خەراجەکەی بۆ خۆی وەربگرێ.

شێخ عەلی بووە فەرمانڕەوای کرداریی سەردەمی شا تەهماسب-بەلای کەمەوە لەوەی تایبەت بەکاروبارە ئایینییەکان بوو- مێژوونووسێکی ئێرانیی وەسفی کردووە و ئەڵێ: لەدوای خۆجە نەسیرەدین توسی، هیچ کەسێك بەپلەی شێخ عەلیی کەرك نەگەیشتووە لەڕیزی زانایانی مەزهەبی جەعفەریی و برەودان بەئایینی راستەقینەی دوانزە ئیمامی، رێگریی خراپەکارانی کردو تەمبێیانی کردو یاسای بیدعەکارانی لەبن کێشاو عەرەقخۆریی نەهێشت و شەریعەتی جێبەجێکردو نوێژی جومعەو جەماعەتی پارێزگاریی کردو کاروباری پێشنوێژو بانگبێژانی رێکخست و نوێژو پەرستشەکانی روون کردەوەو خراپەی خراپەکارانی نەهێشت و

بەرپەرچی ئەوانەی دایەوە کە شوێن پێی شەیتانەکانیان هەڵدەگرت و چاودێرییەکی سەختی خستەسەریان، تەواوی خەڵکی هان دەدا فێری شەریعەت ببن و مەراسیمەکانی ئیسلام شارەزا ببن و بەئایینەوە پەیوەست بن، لەڕۆیشتن و سواربووندا دروشمەکانی شیعەی پەیڕەو دەکرد، فەرمان گەلێکی بەتەواوی ئێران گەیاند لەبارەی یاساکانی دادپەروەری و چۆنێتیی مامەڵەکردنی والییەکان لەگەڵ خەڵك لەوەرگرتنی خەراج و بڕو چەندێتییەکەی، فەرمانیشی دا لەهەموو شارو دێیەکدا پێشنوێژێك دابنرێ بۆ نوێژکردن بەخەڵك و فێرکردنیان لە شەریعەتی ئایین..."[1].

[1] - محسن الأمين، أعيان الشيعة، بيروت١٩٥٨، ج٤١،ص١٧٨- ١٧٦.

# ناکۆکی نێوان ئەلکەرکی و ئەلقەتیفی

ئەو ڕێگەو شێوازەی کە شێخ عەلیی ئەلکەرکیی گرتیەبەر لەخزمەتکردنی دەوڵەتی سەفەوی و وەرگرتنی پۆستی بالآ تیایدا، بووە هۆی تووڕەبوونی زۆرێك زانای شیعەی هاوسەردەمی شێخ عەلی، ئەو زانایانە بیروبۆچوونی پێشینانی خۆیانیان هەبوو، کە هەر حکومەتێك پێشەوا بەڕێوەی نەبات حکومەتێکی ستەمکارەو حەرامە خزمەت بکرێت، ئەو خەراجەش کە حکومەت لەخەڵکی وەردەگرێ داگیرکردنەو حەرامە شەرعناس هیچ شتێکی لێ وەربگرێ، بەپشت بەستن بەوەی لەقورئاندا هاتووە: ﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾ هود: ١١٣،واتا:پاڵ مەدەن بەوانەوە کە ستەمیان کردووە، چونکە دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن و بێجگە لە خوا هیچ پشتیوانێکتان نابێ پاشانیش یارمەتی نادرێن[١].

[١] - بۆ راڤەی ئایەتە پیرۆزەکان، سوودمان لەتەفسیری پوختەی قورئان وەرگرتووە– وەرگێڕ.

لەسەرووی بەرهەڵستکارانی کەرکییەوە، شەرعناسێك هەبوو لەڕووی زانست و پێگەوە یەکسان بوو بەکەرکی، ئەویش شێخ ئیبراهیم ئەلقەتیفی(القطيفي) بوو، ئەمیش دانیشتووی نەجەف بوو، لەوکاتەوە ناکۆکیی کەوتە نێوانیان کە نێردراوی شا گەیشتە نەجەف و بانگهێشتی کەرکیی کرد، نێردراوەکە دیاریی بۆ هەردووکیان هێنابوو، کەرکی دیارییەکەی وەرگرت، بەڵام قەتیفیی رەتیکردەوە، کەرکی رەخنەی لەو کارەی هاوڕێکەی گرت کە دیارییەکەی رەتکردەوەو وتی: "لەڕەتکردنەوەی ئەو دیارییەدا هەڵەت کرد، تاوانت کرد(حەرام) یان مەکروهت ئەنجامداوە، تۆ چاوت لەئیمامی حەسەنی کچەزای پەیامبەر نەکرد کە دیاریی موعاویەی قبوڵکردووە، لەکاتێکدا نە تۆ لەئیمام حەسەن پایەدارتری و نە شاش لەموعاویە خراپترە"[1].

دوای ئەوەی کەرکی داواکەی شای قبوڵکردو خزمەتی دەوڵەتی کرد، ناکۆکیی نێوانیان توند بوویەوە، ئەوەی کە ناکۆکییەکەیانی توندتر کردەوە، ئەوە بوو کەرکی هەموو ئەو شتانەی قبوڵکرد کە دەوڵەتی سەفەوییەت دایانیهێنابوو، نامەی پاڵپشتیی لەو بارەیەوە نووسی، قەتیفیش نامەی دژی بۆ ناردەوە.

گرنگترین ئەو نامانەی کە شێخ عەلیی ئەلکەرکی نووسیبووی، ئەو نامەیەی تایبەت بەخەراج بوو بەناونیشانی(قاطعة اللجاج في حل

---

[1] – محسن الأمين، هەمان سەرچاوە، دمشق١٩٣٦، ج٥، ص٢٠٢.

الخـــراج)، شـــێخ قـــەتیفیش نامەیـــەکی لەوەڵامیـــدا نووســـی بەناونیشانی(الســـراج الوهـــاج لـــدفع عجـــاج قاطعـــة اللجـــاج)، لەپێشەکییەکی قەتیفیدا پێنج خاڵ هاتووە:

یەکەم: لەحەرامێتیی شاردنەوەی زانست و فیقه.

دووەم: حەرامێتیی شوێنکەوتنی سوڵتان لەلایەن زانایانەوە.

سێیەم: لەپیاهەڵدانی ئەو کەسەی هاوکـاری زانسـتخواز ئـەکات و سەرزەنشتکردنی ئەو کەسەی ئازاری ئەدات.

چـوارە: لەپیاهەڵـدانی زانـای ئیشـکەرو سەرزەنشـتکردنی زانـای ئیش نەکەر.

پێنجەم: لەحەرامیی گەڕان بـەدوای فڕوفێـڵ و حـەڵاڵکردنی شـتی ناشەرعیدا.

دیارە ئەو پێنج خاڵە ئاراستە بوون بۆ رەخنەگرتنی کەرکی و ئەو کارەی کە دەدرانە پاڵی و بۆ خزمەتی دەوڵەت بوون.

قەتیفیی لەو نامەیەیدا خەراجی بەستەم و داگیرکردنی سـەروەتی خەڵك دادەنا، ئاماژەی داوە بەوەی چۆن شا لەکەرکیی داوا کـردووە کـار بکـات بـۆ بـرەودان بـەئایین و دەرخسـتنی فـەزڵی شـیعەگەریی ئاوەهاش لـەوی داواکـردووە، بـەڵام ئـەم رەتیکردووەتـەوە، چـونکە بۆچوونی وەهایـە حـەرامی وەرگرتـووەو دەسـتبەرداری کـاری ئـایین بووە، کەوابوو چۆن دەبێتە کەسێکی شیاو بۆ برەودان بەئایین[1].

---

[1] – هەمان سەرچاوە، ج٤١، ص١٨٦.

وەها دەردەکەوێ کە شێخ عەلیی ئەلکەرکی زیادەڕەویی کردبێ لەبرەودان بەداهێنراوەکانی دەوڵەتی سەفەوییەت و لەکار گەلێك ڕەزامەندبووبێ کە لەڕووی شەرعەوە ڕێ نەدراوبووبێتن– هەموویان یان هەندێکیان و ئەوەش وەهای کردووە هەندێ ڕکەبەرو ناحەز بەکەرکیی بڵێن(داهێنەری شیعە)..لەکۆی نامەکانی، نامەیەك بوو لەڕێگەدان بەجنێودان کە ئەمە ناونیشانەکەیەتی(نفحات اللاهوت في لعن الجبت والطاغوت)، نامەیەکی تریش نووسیووە لەئاسایبوونی کڕنۆش بردن بۆ بەندەو کڕنۆش بردن بۆ خۆڵ و گۆڕی حوسێن[1].

لەبابەت گەلێکی تریشدا نامەی نووسی، قەتیفیش وەلأمیانی دەدایەوە.

ئەوەی جێی تێڕامان بێ ئەوەیە، کەرکیی نامەی نووسی لەبارەی واجیب بوونی نوێژی هەینییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا شیعە بۆ ماوەیەکی زۆر زۆر بوو واجیب بوونی نوێژی هەینییان هەڵوەشاندبووەوەو بۆ ئەنجامدانی نوێژی هەینیی مەرجیان دانابوو، کە دەبێ سوڵتانی دادپەروەر بوونی هەبێ[2]، کەرکی بەو باوەڕەی دادپەروەیی لەحکومەتەکەی شادا زۆرو فەراهەمە، بۆیە نوێژی هەینیی واجیب کرد.

[1] – کامل مصطفى، الفکر الشیعي، هەمان سەرچاوە، ل٤١٤، ٤١٦ .

[2] – محسن الأمین، هەمان سەرچاوە،ج٥،ص٢٠٢.

ئەو مشتومڕە توندەی کە لەنێوان کەرکی و قەتیفیدا روویدا بووە هۆی دابەشبوونی زانایانی شیعەی ئەوکات بۆ دوو بەشی ناکۆک، بەلأم ئەو دابەش بوونە زۆری نەخایاندو بەسەرکەوتنی کەرکی و شوێنکەوتەکانی کۆتایی هات، شتێکی گرانیش نییە ئەو هۆیە دەربخرێ کە بووە مایەی ئەو سەرکەوتنە، چونکە ئەگەرکراو و گونجاوە لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتیدا، دەوڵەت بەو سەروەت و سامان و پۆستە لەخشتەبەرانەی کە هەیەتی، دەتوانێ لایەنی زانا پشتگیرەکانی خۆی بەهێز بکات و لایەنی بەرهەڵستکار بێ هێز بکات، دەوڵەتانی کۆنیشمانبینیووە بەجیاوازی بیروباوەڕو رەوتیشیانەوە هەمان ئەو کارەی دەوڵەتی سەفەویەتییان کردووەو سەرکەوتنێکی گەورەشیان بەدەستهێناوە.

# کۆچکردن لە(جەبەل عامیل)ەوە

لەوکاتەی کە دەوڵەتی سەفەوییەت لەئێراندا دەرکەوت، جەبەل عامیل بەڕێنسانسێکی زانستیی بێ وێنە دەڕازایەوە، سەرباری بەرتەسکیی و هەژاریی شوێنەکە، ئەوە زیاتر لەهەر شوێنێکی تری شیعە زانای موجتەهیدی تێدا هەبوو[1]. ئەو ڕێنسانە لەسەدەی چواردەی زایینەوە دەستیپێکرد، واتا سەدەی هەشتی کۆچی و بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار گەشەی دەکرد[2].

ئەکرێ بووترێ، کە جەبەل عامیل لەسەردەمی سوڵتانی سەلیمدا کەوتە نێو سنووری دەوڵەتی عوسمانییەوە، جۆرێکی سەرکوتکاریی دژ بەشیعەی تێدا کرا، جا لەوکاتەی کە دەوڵەتی سەفەویی زانا شیعەکانی لەدەوری خۆی کۆدەکردەوەو پارەو پۆستی

---

[1] - لەواقیعدا دەرکەوتنی نمونەی ئەو ڕێنسانە زانستییە لەناوچەیەکی دابڕاوی وەك (جەبەل عامیل) جێی سەرسامی و پرسیار کردنە، ئایە ئەو هۆیانە چیی بوون بوونە یارمەتیدەری ئەو ڕێنسانە؟ بێگومان بابەتێکی کۆمەڵایەتییەو شیاوی لێکۆڵینەوە لەسەر کردنە.

[2] – محمد كاظم مكي، الحركة الفكرية والأدبية في جبل عامل، بيروت١٩٦٣، ص٦٨.

لەخشتەبەری دەرژاند بەسەریاندا، ئاسایی بوو لەچوارچێوەیەکی بەرفراواندا زانایانی عامیل بۆ ئێران کۆچ بکەن.

دکتۆر کامیل ئەلشەیبیی ئەڵێ:"شەپۆلی زانایانی عامیل بەجۆرێکی بێ هاوشێوە لەمێژووی شیعەگەریدا رژایەسەر ئێران"[1].

بەناوبانگترینی زانایانی جەبەل عامیل کە هاتنە ئێران لەدوای ئەلکەرکی، شێخ حوسێنی کوڕی عەبولسەمەد بوو، شوێن کەرکیی گرتەوە لەپۆستی(شێخی ئیسلام)دا. ژیاننامەی ئەو پیاوە بەڵگە دەدات لەسەر ئەوەی رەوشتێکی جیاواز لەوانەی پێش خۆی هەبوو، وەك کەرکیی ناوبانگی و پۆست نەیگۆڕی، ئەو ژیانەی لەبیر بوو کە مامۆستاکانی لەجەبەل عامیل هەیانبوو لەژیانی سەخت و ماندووبوون بەدوای رزق و رۆزیداو بەو هۆیەشەوە ململانێیەکی دەروونیی ئەکردو لەرۆژگارەکانی کۆتاییدا روویکردە تەصەوف و دونیا بەکەمگرتن و دەستبەرداربوون لەو پۆستە گەورەیەی کە پێی درابوو، رۆیشت بۆ حەج، بەباشی زانی لەبەحرەیندا نیشتەجێ بێ، پاشان نامەی بۆ کوڕەکەی نووسی کە شێخ موحەممەد(ئەلبەهائی)بوو، هانی دا ئێران و هاوڕێیەتی سوڵتان واز لێ بهێنێ، لەکوێ قسەکانی بۆ کوڕەکەی ئەمە بوو:"ئەگەر دونیات دەوێ رووبکەرە هیند، ئەگەر ئاخیرەتت دەوێ رووبکەرە بەحرەین، ئەگەر نە دونیا و نە ئاخیرەتت دەوێ رووبکەرە ولاتی عەجەم".

---

[1] – کامل مصطفى الشيبي، الفكر الشيعي، سەرچاوەی پێشوو، ل٤١٧.

شـێخ حوسـێن لەبەحرەینـدا مـردو گۆڕەکەشـی تـاوەکو ئێسـتا بەناوبانگـە لـەدێی ئەلموصـەلا[1] و خـەڵکیی سـەردانی ئەکـەن و تەبەڕوکی پێ وەردەگرن.

[1] – محسن الأمین، سەرچاوەی پێشوو، دمشق١٩٤٨، ج٢٦، ص٢٤٦– ٢٤٧.

# شا عەباسی گەورە

لەسەردەمی شا عەباسدا کە نازناوی گەورەی هەبوو، دەوڵەتی سەفەوییەت بەلوتکەی شکۆداریی خۆی گەیشت، لەسەردەمی ئەو شایەدا ئیتر ئێران پێویستیی نەما بۆ راکێشانی زانایانی جەبەل عامیل و شوێنانی تر، خۆی بەتوانا بوویەوە زانا بەرهەم بهێنێ.

شا عەباس لەساڵی١٥٨٨ فەرمانڕەوایی وەرگرت لەکاتێکدا حەڤدە ساڵەی تەمەنی تێنەپەڕاندبوو، باسێکی سەیرو دەگمەن دەگێڕنەوە لەبارەی وەرگرتنی دەسەڵاتەوە کە بەڵگەی عەقڵییەتی باوی ئەو کاتەن، پوختەکەی ئەوەیە، ئەستێرەناسان(جادووگران) ئامۆژگاریی شایان کرد بۆ ماوەیەکی کورت دەستبەرداری فەرمانڕەوایی ببێ، چونکە ئەستێرەکان ئاماژە دەدەنە مەترسییەکی سەخت کە لەو ماوەیەدا تووشی خاوەن تەختی دەسەڵات دەبێ، شا بەدەم ئامۆژگارییەکەیانەوە رۆیشت و بۆ ماوەیەکی کورت دەستبەرداری دەسەڵات بوو، لەشوێنیدا پیاوێکی غەیرە موسڵمان بەناوی یوسف دانرا، ئەو داماوە بۆ سێ رۆژ لەسەر تەختی دەسەڵات

بوو، لەرۆژی چوارەمدا شا فەرمانی دا بکوژرێ، تەختی دەسەلاتی لێ وەرگرتەوەو ئەستێرەگرەوەکان بەشایان وت شکۆیەکی گەورەی مەودا درێژی بۆ دەبێ[1].

ئەگەرچی ئەو ئاماژە ئەستێرەناسییە سرووشتێکی ئەفسانەییشی هەیە، بەلام لەپێکهاتەی کەسێتیی شادا کاریگەرییەکی زۆری هەبووە، ئاماژەو ئیلهامێکی دەروونیی بەهێزی بۆ دروستکرد کە شکۆیەکی گەورە بەدەست دەهێنێ وەك ئەوەی ئەستێرەناسەکان پێشبینیان پێ دابوو، دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ زۆربەی ئەو شتانەی کە ئێمە بەئەفسانەی دەزانین و کەم بایەخ دەیبینین، هەندێجار لەتاك و کۆمەڵگەدا کاریگەرییەکی زۆری هەیە.

لەواقیعدا ئەوکاتەی شا عەباس جڵەوی دەسەلاتی دەوڵەتی سەفەوییەتی وەرگرت، دەوڵەتی سەفەوییەت لەرووی رۆژهەلات و رۆژئاواوە لەبەردەم هەڕەشەی توندو لەنێوچووندا بوو، سەرباری مەترسیی رووی دەوڵەتی عوسمانی، مەترسییەکی تریش هات لەرووی دەوڵەتی ئۆزبەك لەسەر سنووری رۆژهەلاتی ئێران، ئۆزبەکییەکان توانیان دوای گەمارۆدانێکی نۆ مانگە شارۆچکەی هێرات فەتح بکەن، دواتر تووسیان فەتحکرد کە مەرقەدی ئیمام عەلیی کوڕی موسا ئەلڕەزای تێدا بوو، زۆربەی دانیشتوانەکەیان سەربڕی و گەنجینەی مەرقەدی ئیمام رەزایان تالان کرد، لەکۆی

[1] Perey Sykes , A Hustory of Persia,London ١٩٥٨,Vol٢,p.١٧٤- ١٧٥ -

ئەوەی تالآنیان کرد پارچە ئەڵماسێك بوو بەقەد هێلکەی مریشکێك ئەبوو، پاشان لەفەتحکردن بەردەوام بوون تاوەکو گەیشتنە نیسابورو سبزوارو ئیسفرایین و تبس و شارەکانی تری خۆراسان.

شا ئیسماعیل دەرکی کرد کە ناتوانێ لەیەك کاتدا لەدوو بەرەوە شەڕ بکات، بۆیە بەباشی زانی لەگەڵ عوسمانییەکاندا ئاشتەوایی بکات تاوەکو بۆ گیان ئۆزبەکییەکان یەکلابێتەوە، ئەوەی ویستی لەساڵی١٥٩٠ بۆی هاتەدی و ڕێککەوتنی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا کرد، پەیمانی پێدا ناوچەکانی ئازەربێجان و جۆرجیاو بەشێك لە لوڕستانی پێ بدات و نەهێڵێ خەڵکەکەی خۆی جنێو بەسێ خەلیفەکە بدەن[1]، پاشا شا عەباس ڕوویکردە ئۆزبەك و توانی لەساڵی١٥٩٧دا شکستێکی گەورەیان بەسەردا بهێنێ و بتوانێ ناوچە لەدەستچووەکان وەربگرێتەوە، بەتایەت توسی پیرۆز(طوس)، لەوکاتەوە سەردەمێکی نوێ لەئێراندا دەستی پێکرد، ئەوەیە کە ئێرانییەکان لەمێژووی نوێیاندا بە"سەردەمی زێڕین"ی دادەنێن.

## هەوڵە ئاوەدانییەکانی عەباس

شا عەباس زۆر عاشقی تەلارسازیی بوو، لێرەشدا شوێنی ئەوەمان نییە باسی هەوڵە ئاوەدانییەکانی ئەو بکەین، تەنیا لەبەر گرنگییە کۆمەڵایەتییەکەی دوو شتی لێ باس دەکەین، یەکەمیان:

---

[1] - Carl Brockelman , History of Islamic Peoples,Comwall ١٩٤٧,p.٣٢٥

پایتەختی لەقەزوینەوە گواستەوە ئەسفەهان و دەستی دایە بوونیاتنانی کۆشت و تەلاری بەرزو مزگەوتی جوان، کە ئەمڕۆ گەشتیاران لەئێراندا رووی تیٚ دەکەن و ئەسفەهان بەو هۆیەوە بووە نمونەی گەشەی ئاوەدانی و ژیاری و ئیتر وترا"ئەسفەهان نیوەی جیهان".

بابەتی دووەمیش گرنگیدانی شا عەباس بوو بەئاوەدانکردنەوەی مەرقەدی رەزا لەتووس و بۆیە کردنی گومەزەکەی بەئاڵوون، لەساڵی١٥٩٨ەوە دەستی پێکردو لەساڵی١٦٠١ توانی پارچە ئەڵماسە بەتالآن براوەکەش بگێڕێتەوە، بەفەتوایەك لەلایەن زانایانەوە ناردی بۆ رۆم بۆ فرۆشتن و بەنرخەکەی هەندیٚ زەوی و موڵکی کڕی و کردیە وەقفی مەرقەدەکە، لەساڵی دواتردا شا عەباس بەپیٚ لەئەسفەهانەوە بەرێکەوت بۆ تووس بەمەبەستی تەبەڕوك وەرگرتن بەسەردانیکردنی ئەو مەرقەدە، ماوەی نێوان ئەسفەهان و تووس هەشسەد میلە، کە گەیشتە ئەویٚ بەدەستی خۆی فتیلەی ئەو مۆمە زۆرانەی بڕی کە مەرقەدەکەیان رۆشنا دەکردەوە، ئەگێڕدرێتەوە کە شێخ ئەلبەهائیی ئامادە بووە و هەندیٚ شیعری وتووە کە ئەمە واتاکەیەتی: فریشتەکان لەئاسمانەوە دابەزین و بەدەوری مۆمەکاندا هوتاف دەکێشن و ئەڵێن ئەی ئەڵڵەو پیاوەی

بەمەقەسـەکەی فتیلـەی مۆمـەکان دەبـڕی، وریابـە بـاڵی جیبریـل نەبڕی[1].

دواتـر شـا عـەباس دەسـتی دایـە هانـدانی ئێرانییـەکان بەهـەر ئامرازێك بـێ و بتـوانن سـەردانی رەزا بکـەن، ئـەوەی لـەو بارەیـەوە کردی، کردنەوەی رێگـا بـوو لەهـەموو ناوچـەکانی ئێرانـەوە بـۆ ئـەو شـوێنەو دروسـتکردنی خـان و شـوێنی مانـەوە بـەجۆرێك لەمێـژووی ئێرانـدا بـێ وێنـە بـووە، ئـەوتریێ ژمـارەی ئـەو خانانـەی ئـەو دروستیکردبوو، گەیشتبووە هەزار خان و هەر خانێك شوێنی سـەدان گەشـتیاری لـێ بووەتـەوە بـەولاخ و کۆڵوباریشـیانەوەو کرێـی لـێ وەرنەگرتوون و تاوەکو ئێستاش شوێنەواری ئەو خانانە ماوەتەوە[2].

هەندێ نووسەر وەهایان داناوە کە شا عەباس بۆیە گرنگیـی داوە بەسەردانیکردنی رەزا، تاوەکو بیکاتە بەدیلی حەج بۆ ئێرانییـەکان، لەوانـە گەڕیـدەی میسـرییە موحەممـەد سـابت کـە لـەبارەی شـا عەباسـەوە ئەڵێ: "ئـەو نەتەوەکـەی لابـرد لەسـەردانیکردنی مەککـە چـونکە رقیـان لەعـەرەب بـوو، ئەیەویسـت ئـەو سـەروەتە زۆرە بـۆ نەتەوەکەی خۆی بهێڵێتەوەو لەوڵاتێکدا خـەرجی نەکـەن کـە رقیـان لێیەتی...."[3].

---

[1] - Peey Sykes,Op.Cit. Vol.٢,p.١٨١

[2] - محمد جواد مغنية، دول الشيعة في التاريخ، النجف، ١٩٦٥، ص١٣٢- ١٣٣.

[3] - محمد ثابت، جولة في ربوع الشرق الأدنى، القاهرة١٩٥٢، ص١٦١.

لەڕوانگەی منەوە، ئەم بۆچوونە لێکدانەوەی هەڵەی تیادا هەیە، چونکە لەواقیعدا شا ئیسماعیل نەیویستووە ئێرانییەکان لەحەجکردن دووربخاتەوەو توانای ئەوەشی نەبووە، بەڵکو ویستوویەتی چاویان لەسەر شوێنە پیرۆزەکانی عێراق لابدات کە لەژێر دەسەلأتی عوسمانییە دوژمنەکانی بوونە، دەبێ ئەوەش لەم بارەیەوە باس بکرێ، ئەو ئێرانیانەی سەردانی شوێنە پیرۆزەکانیان دەکرد لەسەردەمی عوسمانیدا، لەکۆلأنەکانی بەغدا لەسەردەستی منالٚ و لەسەر سنوورو فەرمانگەکانیش لەسەردەستی فەرمانبەران ئازار دەدران، لەگەڕانەوەیان گلەیی و گازندەیان بەشا دەگەیاند، ئەویش بەو کارەی لەو ئازارو ناڕەحەتییەی لەعێراقدا بەسەریان دەهات دووریخستنەوە.

حاڵەکە هەرچۆنێك بێ، ئەوە مەرقەدی رەزا لەتووسدا لەسەردەمی شا عەباسەوە بووەتە گرنگترین رواڵەتەکانی کۆمەڵگەی ئێرانی، بێ دابڕان تاوەکو ئەمڕۆی ئێمە نۆژەنکردنەوەو خزمەتکردنی لێ نەبڕاوەو ناتوانین وێنەیەکی تەواو بدەینە تەلارو رازانەوە هونەری و گەنجینەو ئالتوونەکانی کە چیی مولٚك و وەقف گەلێکی هەیە، کارێکە گەورەترە لەوەسفکردن و بەرەهایی بەدەوڵەمەندترین مەرقەدە پیرۆزەکان و رازاوەترینیان دادەنرێ لەڕووی هونەری تەلارسازی و جوانی شتە هەڵواسراوە گرانبەهاکانەوە[1].

[1] – جعفر الخليلي، موسوعة العتبات المقدسة– قسم خراسان، بيروت١٩٦٨، ص٢٥٨.

سالآنە زۆرێك سەردانیكار سەردانی مەشهەد دەكەن، لەئێستاشدا بەملیۆنان كەس دەتوانن سەردانی بكەن لەتەواوی ئێران و عێراق و تەواوی ولآتانی شیعەوە، لەئێراندا یەكێك سەردانی رەزای كردبێ پێیدەوترێ"مشتی"،وەك پالّدانێك بۆلای مەشهەد(شوێنی ناشتنی رەزا)، كەسێكیش سەردانی كەربەلای كردبێ بۆ سەردانی حوسێن پێیدەوترێ"كبلی"، وەك پالّدانێك بۆلای كەربەلا.

# فەتحکردنی بەغدا

لەسالآنی کۆتایی سەدەی شانزە، لەبریتانیاوە سیر ئەنتۆنی شیرلی و سیر رۆبێرتی برای هاتن بۆ ئێران و لەنێو کەسەکانی داروده‌ستەشیدا پیاوێکی شارەزا هەبوو لەدانانی تۆپ و مووشەك، شا عەباس ئەو هەلەی قۆستەوەو داوای لەو پیاوە کرد سوپاکەی لەتۆپ هاوێشتندا بەهێز بکات بۆ رووبەرووبوونەوەی تۆپەکانی عوسمانی، کە لەو سەدەیەدا بەرەهایی بەگەورەترین تۆپی جیهان دادەنرا.

لەساڵی١٦٠٢ شا دەستیکردە پەلاماردانی سنوورەکانی عوسمانی، دوای دوو ساڵ بەزەبری تۆپە نوێیەکانی شاری تەبرێزی گرتەوە، پاشان سەرکەوتن بەدوای سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا تاوەکو لەساڵی١٦٢٣ لەدوای سێ مانگ گەمارۆدان توانی بەغدا بگرێ ، لەو سێ مانگەدا خەڵك منداڵیان دەخواردو نرخی گوێدرێك گەیشتە هەزار ئەقجە[1] (دراوێکی زیوویی مەغۆلیی بوو کە تائەوکات

[1] – عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، بغداد١٩٤٨، ج٤، ص١٧٧.

کاری پێ دەکراو واتای سپی دەگەیاندو کێشی چوار گرام زیووی هەبوو).

شا ئیسماعیل لەپێشدا چی بەسەر بەغدایا هێنا، شا عەباسیش ئەوەی کرد، مەرقەدی ئەبی حەنیفەو شێخ عەبدولقادری گەیلانیی وێران کرد، پاشان پەرەی بلاوکردەوە بۆ تۆمارکردنی خەڵکانی سووننەی بەغدا تاوەکو هەموویان لەنێو ببات، ئەگەر سەید دراج کلیدار ئەلحوسێن دەستوەردانی نەکردبایە شا عەباس ئەو نیازەی جێبەجێی دەکرد، ئەو سەیدە لای شا خاوەن رێز بوو، توانی بۆ زۆرێکی سووننەی بەغدا تکا بکات و لەپەرتووکی خۆیدا بە"خۆشەویستانی ئەهلی عەبا"واتا شیعە ناویانی تۆمار کردو لەکوشتن رزگاریانی کرد[1].

دوای فەتحکردنی بەغدا، شا عەباس سەردانی مەرقەدە پیرۆزەکانی کرد لەکازمییەو سامەڕاو کەربەلاو نەجەف و پارەیەکی زۆری خەرج کرد بۆ ئاوەدانکردنەوەیان و دیاریی خستنە ئەو شوێنانەوە، بەشێوەیەکی تایبەتیش ئاوەدانکردنەوەکانی روویکردە نەجەف، خانوو و خانی بۆ حەسانەوەی سەردانیکاران دروستکرد و فەرمانی دا بیرە ئاو بۆ ئەو شارۆچکەیە دروست بکرێ و سەربازەکانیشی لەگەڵ کرێکارەکاندا چاڵیان دەکرد تاوەکو ئاوەکەیان گەیاندە شوێنێکی نزیك لەشارچکەکەوە، لەوێدا لەژێر

---

[1] – هەمان سەرچاوە، ل۱۸۰.

زەمینێكیدا گۆماوێكیان دروستكرد بەپەیژە خەڵك بۆی دادەبەزین و ئاویان لێ دەبرد[1].

ئەوەی كە شا ئیسماعیل كردی، لەشوێنێك وێرانەی ئەكردو لەشوێنێكی تر بوونیاتی دەنایەوەو لەیەك كاتدا دڵڕەقیی دەنواندو بەزەییشی دەنواند شتێكی سەیر نەبوو، كارێكە زۆرێكی خەڵك بەجیاوازیی چینایەتیشیان ئەوە دەكەن، جیاوازیی لەنێوان پیاوی سەر جادەو پادشادا نییە، ئەوە هەیە كارەكانی پادشا بەناوبانگەو خەڵك دەیبینێ و زیادەڕۆیی تێدا دەكەن، بەڵام كاری پیاوی سەر جادە كەسانێكی كەم دەیبینن و دوای ماوەیەك لەبیردەچێت. ئەو مرۆڤەی كە بێ جیاوازیی لەنێوان خەڵكدا مامەڵە بكات، بێگومان مرۆڤێكی دەگمەنە(شازە).

سوونە، شا ئیسماعیل بەخراپترینێك دادەنێت كە تەنیا خراپەو ئازاری لێ بینراوە، بەڵام شیعە بەكەسێكی پیرۆزیان وەسف كردووە كە نەریتی ئاوەدانكردنەوەو دادگەری و حەق ویستیی هەبووە، جا كێشەی ئەم دوو كۆمەڵەیە لەهەندێ رووەوە لەكێشەی دوو ئافرەت دەچێ كە بەشەرهاتوون و هەریەكەو چاوی خستووەتەسەر ئەو ئازارەی تووشی منداڵەكەی خۆی بووەو زیادەڕۆیی تیادا ئەكات، بێ ئەوەی لابكاتەوە بەلای ئەو ئازارەی تووشی منداڵی ئافرەتەكەی بەرانبەر بووە.

---

[1] – جعفر محبوبة، ماضي النجف وحاضره، النجف١٩٥٨، ج١، ص١٩٣.

دەگێڕدرێتـــەوە کـــە دوو شۆڕەســـواری ســـەدەکانی ناوەڕاســـت لەڕێگەی پەیکەرێکی کۆندا بەیەك دەگەن و جیاواز ئەبن لەشێوەی رەنگی پەیکەرەکە، یەکێکیان بەزەرد دەیبینێ و ئەوی تر بەشین، لەواقیعدا پەیکەرەکە هەم زەردو هەم شینیش بووە، هەر دیوێکی رەنگێکی هەبووە، پێش ئەوەی لەپەیکەرەکە بکۆڵنەوە دەبێتە مشتومڕیان و سەیریان پێ دێت ئاخۆ بۆ بۆچوونیان جیاوازەو بەو هۆیەوە یەکتر بەسەرسەخت و نکۆڵیکەر تاوانبار ئەکەن، ناکۆکیی نێوانیان دووریخستنەوە حەقیقەتەکە دەربخەن، کە ناکۆکییان زیاتر دەبوو دەمارگیریشیان بۆ بۆچوونی خۆیان توندتر دەبوو، زیاتر رقیان لەیەکتر هەڵدەستا.

# شێخ ئەلبەهائی

لەسەردەمی دەوڵەتی سەفەویەتدا، زۆرێك زانا و بیریاری گەورە دەرکەوتن، بەناوبانگترینیان دوو کەس بوون، ئەوانیش: شێخ موحەممەدی کوڕی شێخ حوسێنی ئەلعامیلیی خاوەن نازناوی(ئەلبەهائی)و، مەلا موحەممەد باقری کوڕی مەلا موحەممەدی تەقیی خاوەن نازناوی(ئەلمەجلیسی)بوون.

ئەلبەهائی لەسەردەمی شا عەباسی گەورەدا ژیاو پۆستی شێخی ئیسلامی وەرگرت، لای شا پێگەیەکی هەبوو کەس پێگەی ئەوی نەبوو، دڵئارام نەبوو بەوەی دونیای لەبەردەم کرایەوەو لەباوکییەوە کە شێخ حوسێنی کوڕی عەبدولصەمەدی ئەلعامیلیی بوو مەیلی دونیا بەکەمگرتن و تەصەوفی بۆ مابوویەوە، لەهەندێ کتێبیشدا نووسیوێتی: ئەگەر لەگەڵ باوکیدا نەهاتبایەتە وڵاتی عەجەم، ئەوە بەهاوڕێیەتی سوڵتان تاقیی نەدەکرایەوە[1]، جارێکی تر نووسیویێتی و وەسفی خۆی دەکات و ئەڵێ:"ئەگەر باوکم(روحی پیرۆز بێ) لەوڵاتی

[1] – محسن الأمین، سەرچاوەی پێشوو، ج٢٦، ص٢٣٥.

عەرەبـــەوە نـــەدەهات و تێکـــەڵ بەپادشـــایان نەبووایـــە، لەخواترساوترینی خەڵك و دونیا بەکەمگرتنیان دەبووم، بەڵام روحی شادبێ منی لەو ولاتەوە دەرهێناو تێکەڵ بەم ولاتە و خەڵکەکەی بووم و رەوشتە خراپەکەیانم وەرگرت و سیفەتی ئەوانم هەڵگرت و لەتێکەڵ بوون بەخەڵکی دونیا تەنیا وتی وتی و مشتومڕو ناکۆکیم وەرگرت، کارەکە وەهای لێهات هەموو نەفامێك ببێتە بەرهەڵستم و هەموو تەمبەڵێکیش پێداگر بوو بۆ بەربەرکانێ کردنم"[1].

بەهائی کەسێکی مەوسوعیی بوو وەك ئیبن سیناو هاوشێوەکانی لەکەسە بەناوبانگەکانی بیریارە کۆنەکان، ئەوانەی کە شارەزاییان هەبوو لەزۆربەی زانست و هونەرەکانی سەردەمی خۆیان، ئەوە کارێك بوو پێچەوانەی سەردەمی ئێمە لەسەردەمانی کۆتادا شتی وەها روویدەدا، بەڵام بەهائیی جیاواز لەئیبن سینا بوو بەهۆی بەناوبانگبوونی بەبیرکاریناس و ئەندازیاری، بەڵام ئیبن ئینا لەپزیشکی و فەلسەفەدا بەناوبانگ بووە.

لەبارەی بەهائییەوە سەبارەت لێهاتوویی بیرکاری و ئەندازیارییەوەی، ئەفسانە گەلێکی دەگێڕدرێتەوە لێکچووی ئەو ئەفسانەن کە لەبارەی ئیبن سیناوە لەپزیشکیدا گێڕدراوەتەوە، تاوەکو ئێستاش لەئێراندا خەڵکیی چیرۆك گەلێك دەگێڕنەوە بێ زیادەڕۆیی و ئەفسانە نیین.

---

[1] - سەرچاوەی پێشوو،ج٤٤،ص٢٣١.

بەهۆی ئەو فێڵ و پیلانگێڕیانەی خۆیان بەپۆستی شێخی ئیسلامەوە دەورە دابوو کە زۆربەی بڕیارە گەورەکان توانای هەڵگرتنیان نییە، بەهائیی لەپۆستی شێخی ئیسلام بێزار بوو، بۆیە چووە ژیانی تەصەوف و گەڕان بەدوای زانست بەشێوازی موسڵمانانی سەرەتا، بەرگی دەروێشیی کردەبەر و دەستی کردە گەڕان بەشوێنە جیاوازەکانی وڵاتانی ئیسلامیدا وەك تورکیاو وڵاتی شام و میسر و حیجاز، ماوەیەك لەقودس نیشتەجێ بوو، هەروەك لەدیمەشق و قاهیرەش ماوەیەك نیشتەجێ بوو، وتراوە گەڕانەکەی زیاتر لەسیساڵی خایاندووەو بووەتە جێی سەرسامیی زاناو رۆشنبیرانی هەموو شارێك کە ئەو رووی لێ کردبێ، چونکە لەزانست وەرگرتندا دڵسۆزو بیرکردنەوەی ئازاد بوو، ریابازی و خۆبەگەورە زانینی نەبوو.

ئەلبەهائیی لەماوەی گەڕانەکەیدا کتێبە بەناوبانگەکەی نووسیەوە کە ناونیشانی(الکشکول)ی هەیە، لەو هەمانە سواڵکەرییەوە ناوی ناوە کە دەروێشەکان هەڵی دەگرن و خێرو خێراتی تێ دەکەن، لەجۆری خۆیدا کتێبێکی تاقانەیە، بەو هەمانە سواڵکەرییەی دەروێشەکانەوە چواندوویەتی، لەو رووەوەی زانیاریی هەمەجۆری تێدا کۆکردووەتەوە، لەو کتێبەدا خوێنەر شتی فەلسەفی و سۆفیانەو فیقهی و بیرکاری و شتی تر دەبینێ، دواتریش هەندێ دانەر هەوڵیانداوە لاسایی ئەلبەهائیی بکەنەوەو بەجۆری

کتێبی "الکشکول" کتێبیان نووسیوەتەوە، بەلاّم بەئاستی ئەو نەگەیشتوون، ئاخۆ جیاوازیی نێوان داهێنەرو لاساییکەرەوە چەندە زۆرە!

ئەوەی لەبارەی بەهائییەوە جێی تێڕوانینە، ئەوەیە کە ئەهلی سوننە بەکەسێکی سوننە مەزهەبی دادەنێن و شیعەش بەشیعەی دادەنێن، کتێبە کەشکۆڵەکەشی لەمیسرو ئێراندا وەك یەك برەوی وەرگرتووەو دواتر لەو دوو وڵاتە چاپکرا.

تێبینیی دەکرێ لەنێوان چاپە ئێرانی و میسرییەکەدا جیاوازیی هەیە، لەنوسخە ئێرانییەکەدا هەندێ شتی زیادە هەیە گونجاوە بەحەزی دەوڵەتی سەفەوی و ئەو بیروباوەڕانەی کە دایهێنا، ئێمەش نازانین ئەوە هی خودی دانەرە یان کاری نوسخە هەڵگرەوەکانە؟!

# تیۆری بەهائیی لەمەعریفەدا

ئێمە کە لەباسی ژیاننامەی بەهائیداین، گونجاوە بەکورتییش بێ ئاماژەیەك بدەینە تیۆری ئەو لەمەعریفەدا، کە بەڵگەی بیرکردنەوەی ئازادو لێبووردەیی ئایینیی ئەون.

پوختەی تیۆرەکە وەك ئەوەی لەکتێبی رەخنەگرانیدا هاتووە ئەوەیە: "کەسی ئەرکدار ئەگەر هەوڵی خۆی دا بۆ دەستخستنی بەڵگە، ئەگەر لەبیروبۆچوونیشدا هەڵەی کرد هیچ تاوانێکی لەسەر نییەو لەدۆزەخیشدا نەمر نابێ ئەگەر پێچەوانەی حەق و راستیش بێ"[1]، [2].

---

[1] – عبد الله نعمة، فلاسفة الشيعة، بيروت بدون تاريخ، ص٤٠٦.

[2] - بەهائیی هەوڵیداوە سنووری بیروباوەڕەکان نەهێڵێ، لەخودی خۆیدا کارێکی پێچەوانەیە بەکاری پەیامبەران، ناکرێ بەو پێوەرەی ئەو لەگەڵ بیروباوەڕدا مامەڵە بکرێ و بەڕاست بڕوانرێتە هەموو بیروباوەڕەکان، پەیامبەران بۆ ئەوە هاتوون بیروباوەڕی راست و چەوت بۆ خەڵکیی روون بکەنەوەو بەو عەقڵەی خوای گەورە بەمرۆڤی داوە و لەژێر رۆشنایی ئەو پەیامەی پەیامبەرەکە هێناوێتی مرۆڤە ژیرەکان دەرکی حەقیقەتیان کردووەو خەڵکیان بەجێ نەهێشتووە بەو باوەڕە ترسناکەی بەهائیی کار بکەن– وەرگێڕ.

ئەم تیۆرە گرنگییەکی گەورەی هەیە، ئەگەرچی سادە دەردەکەوێ، بەلاّم لەواقیعدا گونجاوە لەگەڵ ئەو رووداوانەی کە لێکۆڵینەوە درووني و کۆمەلاّیەتییەکان پێیگەیشتوون، بەهائیش ئەمەی لەگەڕانی بەرفراوانی نێو خەڵك وەریگرتووەو بەتێکەڵبوونی بەهەڵگرانی بیروباوەڕە جیاوازەکان.

ئەکرێ بووترێ کە هەموو بیریارێکی بیر دروست ئەگەر بڕوانێتە بیروباوەڕە جیاوازەکان، دەتوانێ راستەقینەیەکی رووني تێدا دەربخات، ئەویش ئەوەیە هەموو خاوەن بیروباوەڕێك دڵنیاییانە باوەڕی بەڕاستێتیی باوەڕو بیروباوەڕی خۆی هەیە، چەندە بیربکاتەوەو رابمێنێ ناتوانێ لەبەڵگەو قاڵبی لۆژیکیی و گونجاو بەبیروباوەڕەکەی دەربچێ، واتای ئەوەیە مرۆڤ لەسەر هیچ بیروباوەڕێك سەرزەنشت ناکرێ کە لەچوارچێوە کۆمەلاّیەتییەکەی وەریگرتووەو لەسەری پەروەرد بووە، چونکە ئەو بیروباوەڕە لەڕوانگەی ئەوەوە راستە هەروەك چۆن لەڕوانگەی خۆمانەوە بیروباوەڕی خۆمان راستە، ئەگەر لەژینگەی ئەودا پێبگەیشتینایە هەمان بیروباوەڕی ئەومان ئەبوو، ئەگەر ئەویش لەژینگەی ئێمە بوایە هەمان بیروباوەڕی ئێمەی دەبوو.

پوختەی قسە، مرۆڤ زۆرجار بەویست و بیرکردنەوەی خۆی ئاييني خۆی هەڵنابژێرێ، بەڵکو بەئامادەکراوییەوە لەژینگە

کۆمەلآیەتییەکەیەوە وەریدەگریٚ و وەها تێڕوانین ئەکات کە باشترین بیروباوەڕێکە بۆ خەڵك دابەزیووە، ئەمەیە سرووشتی ملیۆنان مرۆڤ!

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە، جاحیزیش تیۆرێکی هاوشێوەی ئەم تیۆرەی بەهائیی هێنا[1] بەلاّم دژایەتیی کراو پاشان تیۆرەکەی لەنێوچوو، تەنیا برگە گەلێکی لیٚ ماوەتەوە کە رەخنەگرەکانی هێناویانەتەوە.

بۆچوونی جاحیز وەها بوو، کەسی نەخوێندەوار کە لەدێیەکی دوورەدەست یان لەژینگەیەکی کۆمەلآیەتیی داخراودا دەژی، تەنیا ئەو بیروباوەڕە دەناسێت کە لەسەری گەورە بووەو تەنیا لەچوارچێوەی ئەو بیروباوەڕەدا دەتوانیٚ بیربکاتەوە، لەوەدا سەرزەنشتکراو نییەو خوای گەورە سزای نادات، چونکە هەموو کەسێك بەپێی توای خۆی ئەرکی لەسەر شانە.

جاحیز ئەوە پوخت دەکاتەوە کە خوای گەورە لەبێباوەڕان تۆڵە ناکاتەوە، تەنیا ئەوانەیان نەبیٚ کە حەق دەبینن و لێی دووردەگرن، لەبەر هۆی ناوبانگی و سەرۆکایەتیی بیٚ یان لەبەر هەر هۆیەکی تر، ئەوانی تری بێباوەڕان کە زۆرینەی خەڵکن، ستەمە گەر سزا بدرێن، چونکە تەنیا لەڕێگەی ئەو نەریت و بیروباوەڕانەوە حەق دەناسن کە

[1] - سەبارەت بەتیۆرەکەی جاحیز بڕوانە ئەم کتێبە: منطق ابن خلدون في ضوء حضارته و شخصيته للوردي، القاهرة١٩٦٢، ص٤٩- ٥٢.

لەسەری گەورە بوونەو پێگەیشتوون، خوای گەورەش ستەم لەبەندەکانی ناکات"[1].

پێویست بەوە ناکات بڵێین کە ئەم تیۆرەی جاحیزو بەهائیی هێناویانە لەلایەن ئەو دەمارگیرانەوە قبوڵ ناکرێت، کە نەریتیان گرتووە روانینێکی دوژمنکارانەی سەختیان بۆ ئەوانە هەبێ کە لەبیروباوەڕیاندا پێچەوانەن و بەنەمریان دەزانن لەدۆزەخداو تکایان بۆ ناکرێت و خوای گەورە هیچ عوزرو بیانوویەکیان لێ قبوڵ ناکات. سرووشتی دەمارگیران وەهایە و تێڕوانین ئەکەن، راستیی روونەو لەرێگەی بەڵگەی عەقڵیشەوە گەیشتنە ئەو رێگەیە ئاسانە، پاشان وەهای تێڕوانین ئەکەن کە ئەوانەی پێچەوانەی ئەوانن بەسەرسەختییەوە لەحەق لایانداوەو بەئەنەقەست دووریان گرتووە، ئەوەشە وەهای کردووە دەمارگیرانی بیروباوەڕە جیاوازەکان دوودڵ نەبن لەئازارو ئەشکەنجەدان و سەربڕینی ئەوانەی پێچەوانەیانن و ژن و منداڵیان بکەنە کۆیلە، بەبێ ئەوەی دڵێک بەسۆزیان بکات و ویژدانێك بەئاگایان بهێنێتەوە.

زیاتر لەزانایەك لەسەردەمی خۆی و دواتریدا وەڵامی بەهائییان داوەتەوە، لەشتێکی سەیردا پیاوێکی ئایینیی هەوڵیداوە بەرگریی لەبەهائیی بکات و ئەڵێ: "پێچەوانەو جیاوازەکان هەوڵیان نەداوە بەڵگە بەدەست بخەن، ئەگەر هەوڵیان بدابایە بەزۆریی بەحەق

---

[1] - أحمد أمين، ضحى الإسلام، القاهرة١٩٤٣،ج٣، ص٢٣٨.

دەگەیشتن"[1]، جا ئەم پیاوە وەك دەمـارگیرە هاوشێوەكانی لەسـەر بیروباوەڕێكی دیاریكراو پێگەیشتووەو وەهای تێـڕوانین كـردووە كـە حەق روونە و نەیزانیووە پێچەوانەكارانیش لەسـەر بیروبـاوەڕێكی تـر پێگەیشتوونەو ئەوانیش وەكو ئەم وەهای تێڕوانین ئەكەن كـە حـەق روونـــە﴿ كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ المؤمنـون: ٥٣،واتـــا: هەر كۆمەڵ و دەستەیەك دڵخۆشن بەو(بەشە ئایینەی) كە هەیانە.

[1] - محسن الأمين، سەرچاوەی پێشوو، ج٤٤، ص٢٣٨.

# موحەممەد باقرِ ئەلمەجلیسی

"مەلا موحەممەد باقرِ ئەلمەجلیسی" لەقۆناغی کۆتایی دەوڵەتی سەفەوییەتدا ژیا، لەساڵی١٦٩٩ز مرد، واتا پێش رووخانی دەوڵەتی سەفەوی بەبیست و سێ ساڵ، لەهەندێ رووەوە جیاواز لەشێخ بەهائیی بوو، تەنیا دوو جیاوازییان باس دەکەین، ئەوانیش:

**یەکەم:** مەجلیسیی ژیانێکی خۆش و گەورەیی کرد، دڵئارامانە بەو جۆرە خۆشگوزەرانییە دەژیاو پێی رازیی بوو، پێچەوانەی شێخ بەهائی، ئەلمەجلیسیی لەسەردەمی شا سولەیماندا پۆستی شێخی ئیسلامی وەرگرت، پاشان لەسەردەمی شا حوسێنی کۆتا پادشای دەوڵەتی سەفەوییەتیش وەك مەزن راگرتنێك بۆی پۆستی(مەلا باشی)یشی پێ درا، واتا سەرۆکی زانایان.

**دووەم:** ئەلمەجلیسی زۆر دەمارگیر بوو بۆ بیروباوەڕەکەی و لەگەڵ هیچ بیروباوەڕێکی تردا نەرم و لێبووردە نەبوو، دەوڵەتی لەخۆبایی کرد بەسەرکوتکردنی تەواوی ئەو پێچەوانەکارو جیاوازانەی لەنێو سنووری دەوڵەتی ئێراندا بوون وەك سوننە

مەزهەب و سۆفی و مەجوسی و جولەکەو گاورەکان، فەلسەفییەکانیش لەدەستی سەلامەت نەبوون، چونکە بەشوێنکەوتەی گریکە بێباوەڕەکان دای دەنان[1].

مەجلیسیی بەزۆربوونی دانراوەکانی بەناوبانگ بووە، بەتایبەت کتێبەکەی(بحار الأنوار) کە لەبیست و پێنج بەرگی گەورە پێکهاتووە(ئێستا لە١١٠بەش چاپکراوە)، لەزۆریی کتێبەکانی مەجلیسیدا زیادەڕۆیی کراوە، تائەوەی وتراوە رۆژانە ئەندازەی پەنجا هەزار وشەی نووسیوە[2]، هەموو ئەوانەی بەدەستی خۆی نەنووسیوە، بەڵکو زۆرێك بۆی نووسیویانەتەوەو رێنماییانی کردووە کە چی شتێك لەسەرچاوەکانەوە بگوازنەوە، دەوڵەت لەوەدا هاوکاریی کردووە، جارێکیان هەواڵی پێ دراوە کە یەکێك لەو کتێبانەی ئەو پێویستی پێی هەیە لەیەمەندا بوونی هەیە، ئەویش هەواڵی ئەوە بەشا دەگەیەنێ، شایش لەگەڵ دیاری گەلێکی زۆردا شاند دەنێرێتە لای پادشای یەمەن بەمەبەستی دەستخستنی ئەو کتێبە[3].

ئەلمەجلیسیی کتێبی(بحار الأنوار)ی بەزمانی عەرەبیی نووسیوەتەوە، دانراوەکانی تریشی بەزمانی فارسی، دانراوە[4]

---

1- Laurence Loekhart , the Fall of the Safavi Dynasty, Cambridge,١٩٥٦.p.٧٠-٧١

2- Edward Browne.Op.Cit.Vol.٢.p.٤٠٤

3- محسن الأمين، سەرچاوەی پێشوو، ج٤٤، ص٩٧- ١٠٠.

فارسییەکانی بەشێوازێکی سادە نووسیووە، ئەوەشە کاریگەرییەکی زۆری کردووەتە گەلی ئێران، وتراوە کتێبەکەی کە ناونیشانی(حق الیقین)ی هەیە، بووەتە هۆی بەشیعەکردنی حەفتا هەزار سوونەی ئێران[1].

هەرچی کتێبی(بحار الأنوار)ە، ئەوە پلەو پێگەیەکی تری هەیە، گەورەترین کتێبە لای شیعەو بەمەوسوعەیەکی گەورە دادەنرێ، باس و هەواڵ و زانستەکانی شیعەی تێدا کۆکردووەتەوە، لەبۆچوونی هەندێ لێکۆڵەردا وەهایە کە ئەلمەجلیسیی بەو کتێبەی زیانی لەشیعە داوە زۆرتر لەوەی سوودی پێ بگەیەنێ، هەرچی دەستکەوتبێ لەهەواڵ و چیرۆك و ئەفسانە بێ جیاکردنەوەی باش و خراپ کۆیکردووەتەوەو خستوویەتییە بەر دەستی خەڵك، پاشان پرسە خوێنەکان و وتاربێژانی سەر مینبەر هاتن و چییان لەو کتێبە بەدڵ بووایە بەزیادەڕۆیی و ئەفسانەوە خستیانە بیرومێشکی خەڵکە گشتییەکەوەو وەهایان لەخەڵکەکە کرد لەجیهانێکی خەیاڵید بفڕن کە پەیوەندیی بەو جیهانە واقیعییەوە نەبێ تیایدا دەژێن.

کاتێك دانانی کتێبی(بحار الأنوار)تەواو بوو، شا هەندێ لەموڵکە تایبەتەکانی بۆ لەبەرگرتنەوەی ئەو کتێبەو بڵاوکردنەوەی بەسەر خوێندکاراندا وەقف کرد، کاتێکیش چاپی بەردین هێنرایە ئێرانەوە لەسەردەمی قاجاریدا، ئەو کتێبە لەپێشەوەی دانراوەکانەوە بوو کە

---

[1] – دوایت دونلدسن، عقیدة الشیعة. بەعەرەبیکردنی ع. م، القاهرة١٩٤٦، ص٣٠٢.

لەچوارچێوەیەکی بەرفراواندا چاپکرا، تیراژێکی زۆری لێ هێنرایە عێراقەوەو بووە هۆی بڵاوبوونەوەی زانیارییە لاواز و بێ کەڵکەکان لەنێو گەلی عێراقدا، بەوجۆرەی لەئێراندا روویدا.

# هۆکارو پاڵنەرەکانی دروستبوونی دەوڵەتی سەفەوییەت

"عەلس ئەحمەد رەشید*"

ئێران وەختی خۆی ناودەبرا بەوڵاتی فارس، دوای ئەوەی ئیسلام رۆیشتە ئەوێوە ناوبرا بەعێراقی عەجەم و کەوتە ژێر دەسەلاتی خەلیفە ئەمەوییەکان، لەسەردەمی عەباسییەکانیشدا ئێران دابەش بوو بۆ ناوچە گەلێك لەلایەن خەلیفە عەباسییەکانەوە کۆمەڵە میرێك فەرمانڕەواییان دەکرد، دوای ئەوەش لەهەندێ ماوەی جیاوازدا حکومەت گەلێکی سەربەخۆ پێکهات، هەندێ لەو حکومەتانە بنەچە ئێرانیی بوون، بەلام نەیانتوانی ئێران یەکبخەن و بیکەنە دەوڵەتێکی سەربەخۆو لەخیلافەتی عەباسیی جیای بکەنەوە، بەلام سەفەوییەکان توانیان ئێران بکەنە قەوارەیەکی سیاسیی یەکگرتوو دەوڵەتێکی سەرتاسەریی بەهێز و مەزهەبێکی فەرمیی فەرمانڕەوایی

* - لێکۆڵەرو نووسەرو وانەبێژی زمانناسی و هیرمینۆتیقا، ئێران.

بکات کە جیاواز بێ لەمەزهەبی باوی دەوڵەتانی هاوسێ هەر لەساڵی١٥٠١ەوە تاوەکو١٧٧٢، تائەوەی حکومەتی سەفەوییەت بانگەشەی سەرکردایەتی کردنی تەواوی جیهانی ئیسلامیی ئەکرد، ئێمەش لەم بابەتەدا هەوڵ دەدەین ئەو هۆکارانە روون بکەینەوە کە بوونە هۆی دروستبوونی دەوڵەتی شیعەی سەفەویی لەئێراندا، لەڕووە جیاوازەکانی ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە.

یەکەم: پاشخانی شیعە لەپێش سەفەوییەت

هەر لەسەدەی یەکەمی ئیسلامییەوە شیعەگەریی لەوڵاتی فارسدا دەرکەوت، کاتێك هەندێ عەلەوی لەچنگ فەرمانڕەوایی ئەمەویی هەڵهاتن و پەنایان بردە بەر فارس و فارسەکانیش دالّدەی ئەوانیان دا، چونکە رق و دوژمنایەتییان بەرانبەر دەسەلاتی ئەمەویی هەبوو کە خراپ مامەڵەی مەوالییەکانی ئەکردو رەگەزپەرستانە لەگەڵیاندا دەجولایەوە.

لەبەر هۆکار گەلێکی جیاواز، شیعە لەو ولاتەدا بلاوبوویەوە کە ئەمڕۆ بەئێران ناودەبرێت، لەو هۆکارانە:

١- پەرچەکرداری رووخانی ئیمپراتۆرییەتی فارس و زاڵبوونی عەرەب بەسەریدا.

٢- نزیکیی روحی باتنی(ناخ) لەشیعەدا لەگەڵ روحی عیرفانیی لەئایینی زەردەشتییەت و ئایینە رۆژهەڵاتییەکان بەشێوەیەکی گشتی.

٣- فەرمانڕەوایانی عەرەب خراپ مامەڵەی هاونیشتیمانە غەیرە عەرەبەکانیان ئەکرد، بەزۆرییش پشتگیریی شەرعناس و زانا سوونندیەکانیان هەبوو[١].

حەزو مەیلی ئێرانییەکان تەنیا رووەو مەزهەبی ئیمامیی نەبوو، بەڵکو رەوت گەلێکی جیاوازی شیعە دەرکەوت، گرنگترینیان مەزهەبی زەیدیی لەتەبرستان لەباکوورو ئیسماعیلییە لەخۆراسان و ناوچەکانی رۆژئاواو باشووری ئێران، مەزهەبی ئیمامیش لەناوچە چیاییەکان لەناوەڕاست.

ئەم حەزە تەنیا لەواندا کورت نەهاتەوە کە مەزهەبێکی شیعە هەڵبژێرن، بەڵکو زۆرێکی ئەهلی سووننەش حەزی شیعەگەرییان هەبوو، ئەوە دەرکەوت کە دەناسرا بەڕەوتی سووننەی دوانزە ئیمامی، کە زۆرێک زاناو فەرموودەناس و شاعیریان پێکدەهێناو بەشێوەیەکی فەرمیی سەر بەیەکێك لەمەزهەبە سووننییەکان بوون، بەلام مەیلێکی رووحیی قووڵیان بۆ دروست بوو بۆ پێشەوایانی

---

[١] - بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە: الشيعة في إيران، رسول جعفريان، المترجم: علي هاشم الأسدي، منشورات "مركز الدراسات الإسلامية"، مشهد، ١٩٩٩.

شیعەو زۆرجار گەیشتە ئاستی زیادەڕۆیی[١]، لەدیارترین کەسە ناودارەکانی ئەو ڕەوتە: حاکمی نیسابووری[٢](ك٤٠٥ك/ ١٠١٤ز)خاوەن کتێبی"المستدرك على الصحيحين) و حاکمی حسکانی(لەسەدەی پێنجی کۆچی/ دوانزەی زایین ژیاوە) خاوەن کتێبی(شواهد التنزيل)ە، مەلا جامی(ك٨٩٨ك/ ١٤٩٢ز) شاعیری بەناوبانگی ئێرانی[٣]، مەلا حوسێنی کاشفی(ك٩١٠ك/ ١٥٠٤ز) خاوەن کتێبی(روضة الشهداء)[٤] و کەسانی تریش.

لەئاستی وەرگرتنی ئیسلام لەئێراندا، هەندێ خاڵی هاوبەشی سوونەگەری و شیعەگەریی هەیە، ئەو خاڵەش بەزۆریی لەئینتیمای روحی و سۆفیگەرییدا دەردەکەوێ کە رێژەییانە لەکۆتی روانینی فیقهی و کەلامیی ئازادە.

---

[١] - بڕوانە پێشەکی"رسول جعفريان) لەسەر کتێبی: وسيلة الخادم إلى المخدوم در شرح صوات ضهارده معصوم . فضل الله بن روز بهان الخنجي الأصفهاني، منشورات انصاريان، قم،١٩٩٥.

[٢] - خۆشویستنی ئالوبەیتی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) مەیل بوون بۆ شیعە ناگەیەنێ، ئەمە پێزانین و ئەرکێکە سوونە مەزهەبەکان تانەو جیاوازیی لەنێو هاوەڵاندا بەکار نامێنن و بەلایانەوە فەزڵدارن– وەرگێڕ.

[٣] - شاعیرێکی سۆفیی سوونیی ناسراوە، دیوانە شیعری عیرفانیی هەیە کە ستایش و پیاهەڵدانی رەنگ و بۆنێکی شیعەییانەی هەڵگرتووە بۆ پێشەوایانی شیعە، گۆڕەکەی لەشاری (تربت جام)ە، شارێکی سوونە مەزهەبەو زۆرێك سوونەی خۆراسان و بلوشستان بۆ سەردانیکردنی گۆڕەکەی دێنە ئەو شارە.

[٤] - ناونیشانی یەکەمین کتێبی کوژرانی ئیمام حوسێنەو بەزمانی فارسییە، چیرۆك گەلێکی ئەفسانەی لەخۆگرتووە سەبارەت بەڕووداوی عاشورا.

ئەگەرچی ئەم شیعەگەرییە لەسەردەمی سەفەوییەتدا گۆڕا بۆ دامەزراوەیەکی فیقهیی کەلامیی تەواو کراو و رکەبەرایەتیی دامەزراوە سوونییەکانی تری ئەکرد و خۆی بەبەدیل دەردەخست، بەڵام لەپێش سەفەویەتدا جۆرێك رۆشنبیریی گشتیی ئیسلامیی بوو لەئێرانداو جیاوازییە فیقهی و کەلامییەکان بەشێکی گەورەی تێدا داگیرنەکردبوو[1].

دوای هاتنی مەغۆل بۆ وڵاتی فارس، بەپلەبەندیی بڵاوبوونەوەی شیعە زۆرتر بوویەوەو هەڵکشا، چونکە ئەوان سیاسەتێکی نەرموونیانیان هەبوو بەرانبەر ئایین و مەزهەبەکان، بۆیە بەفەزڵی زانایانی شیعە لەگەیاندنی مەزهەبەکەیان بەناوچە جیاوازەکانی وڵات بەشارو لادێکان کەم کەم مەزهەبەکەیان بڵاوکردەوە و وەهای لێهات لەپێش دروستبوونی دەوڵەتی سەفەوییەت شیعەگەریی بووە بەربڵاوترینی مەزهەبە ئیسلامییەکان و هەموو نیشانەکان ئاماژەیان دەدا بەدروستبوونی دەوڵەتێکی شیعە لەئێرانداو بەشێوەیەکی فەرمی گۆڕانکاریی و لادانی ئایینیی رابگەیەنێ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە لەسەردەستی فەرمانڕەوا سەفەوییەکان بۆ برەودان بەشیعە فشار بەکارنەهێنرێ، فشار کرا بەڵام فشارکردنەکە هۆکاری سەرەکیی دروستبوونی دەوڵەتێکی شیعە نەبووە لەئێراندا، بەڵکو

---

[1] - بروانە: الفقیه والسلطان، وجیه کوثراني، دار الطلیعة، بیروت، ٢٠٠١، ص١٠١– ١٠٥.

فشـــارکردنەکە قۆنـــاغی یەکلاکردنـــەوەی گۆڕانکـــاریی ئـــایینیی دروستبووی ئەو ولأتە بوو.

بـەپوختی، بلأوبوونـەوەی شـیعە لەئێرانـدا بـەهۆی دروسـتبوونی دەوڵـەتی سـەفەوییەتەوە نـەبووە وەك ئـەوەی لای هەنـدێ نووسـەر دیارە، بەپێچەوانەوە، دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوییەت بەئـەنجامی دەرکەوتنی شیعە دادەنرێ لەئێراندا[1].

لـە دەیـە گـەلێکی پـێش دروسـتبوونی دەوڵـەتی سـەفەوییەت، بنەماڵەی سەفەوییەت لەسوننە مەزهەبەوە بوونـە شـیعە مەزهـەب، ئەوەش بەڵگەیە بۆ ئـەو قسـەیەمان کـە پەلکێشـانی شیعە، یـەکێك بـووە لـەهۆکارەکانی دروسـتبوونی دەوڵـەتی سـەفەوییەت، نـەك سـەفەوییەت هۆکـار بـووبێ لەدەرکـەوتن و بلأوبوونـەوەی شـیعە لەئێراندا.

لەسەردەمی جونەیدەوە کە یەکێك بوو لەنـەوەکانی صـەفیەدینی بـاپیری شـا ئیسـماعیلی دامەزرێنـەری دەوڵـەتی سـەفەوییەت، لەبنەماڵەی سەفەوییەتدا شیعە تێکەڵ بەتەصەوف بوو[2]، زۆرێك هـۆو کارەکتـەر هـەبوو یارمەتیـدەری نزیکبوونـەوەی شـیعەگەری و سۆفیگەریی بـوون، وەکـو چـەمکی زوهـدو ویلایـەتی ئامـادەبووان بەهێزی ئیمام و قوتب لەفیکرو کەلەپووری شیعەو سۆفیی وەك یەك،

---

[1] – هەمان سەرچاوە.

[2] - صفویە در عرصە دین فرهنك وسیاست(الصفویة علی الصعید الدیني والثقافي والسیاسي)،رسول جعفریان، ج٢، ص٥١٥.

سەرباری دیاردەی زیادەڕۆیی لای هەندێ کۆمەڵی شیعە کە زۆرێك بیری هاوبەشیان لەگەڵ سۆفیگەرییدا هەبوو، ئەوەش رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەڕوخاندنی دیواری نێوان ئەو جۆرە شیعەگەرییە زیادەڕۆییەو تەصەوف[1].

وەك نمونەیەکی نزیکبوونەوەی سۆفیگەری–شیعەگەری، تەریقەتی ئەلکوبراوی هەندێ فەیلەسوفی سۆفییەکانی راسپارد کە ئەمانەن بوون: عەلائودەولەی سمنانی(ك١٣٣٥ز) و سەید عەلیی هەمەدانی(ك١٣٨٥ز) بۆ بەراوردکردنی هەندێ دەقی دەستنووسی فیکری سۆفیی سوونی و ئیمامیی شیعە لەبارەی تێکەڵکردنی بیروباوەڕی غەیببوونی ئیمام و قوتبی زەمانەوە لەڕووی ئەو ئامادەییەی هەمیشە لەگەردووندا هەیەتی[2].

ئەگەر ئەم تێکەڵکردنە فیکرییە لەبەرچاو بگرین کە لەپێش سەرکەوتنی شا ئیسماعیل ژیانی روحیی لەئێران تایبەتمەندکرد ، تێدەگەین بۆچی لەدیاریکردنی مەزهەبییەتی شێخ صەفیەدین(ك١٢٣٤ز) خاوەن تەریقەتی سەفەوییەت کارەکە لەمێژوونووسان شێواوە و ئەپرسن: ئاخۆ سووننە مەزهەب بووە یان شیعە مەزهەب؟ ئەوەی ئەو تێکەڵکردنە شیدەکاتەوە، زاڵبوونی

---

[1] - الصلة بين التصوف والتشيع، مصطفى كامل الشيبي، ج٢، ص٣٦١– ٣٦٢.

[2] – سەبارەت بەکاریگەریی ئەو تێکەڵکردنە لەشیعری فارسیدا، بڕوانە: حسن الأمين، دائرة المعارف الإسلامية الشيعية، Encyclopedia of Islam:Art Iran ((التصوف في الشعر الفارسي))، ج٢، ص٣٣٩.

جۆرێك رۆشنبیریی هەمە جۆرو سەرچاوەو دەربڕینی ئیسلامییە لەئێراندا، رەنگە دیارترین ئەو دەربڕینانە لەپێش ئەوەی تەریقەتی سەفەوییەت ببێتە دەسەلاَتێکی سەفەوی، کۆکردنەوەی نێوان تەصەوف و ئیمامەت بێ، جا لەچوارچێوەی ئەو کۆکردنەوەیەدا پرسیارکردن لەبارەی مەزهەبییەتی تەریقەتی سەفەوییەت دەبێتە کاری دووەم و مامناوەندی.

مێژوونووسان وەهای دەبینن کە شێخ صەفیەدین سوونە مەزهەب بووە، بابەتی شیعەگەرییەتییەکەی و گەڕاندنەوەی رەچەڵەکی بۆ ئیمام موسای کوڕی جەعفەری کازم، گێڕانەوەیەکە لەسەردەمی ئیسماعیلی سەفەویدا دروستکرا وەك بەشێك لەئامادەسازییکردنی سوڵتانییەت.

گێڕانەوە مێژووییەکان باسدەکەن، کە سەرکردەکانی تەریقەتی سەفەوییەت لەسەردەمی شێخ خواجە عەلی و لەسەردەمی شێخ جونەید(ك٨٥١ك/ ١٤٤٧ز)و شێخ حەیدەری کوڕی(ك٨٩٣ك/ ١٤٨٧ز) بەرەو لای شیعەگەریی خواربوونەوەو لەو ماوەیەدا زۆرێك هۆزو دێهاتنشین پەیوەندییان کردە تەریقەتی سەفەویەتەوەو لەسەر بیروباوەڕی مەهدییەت بزووتنەوەیەکیان دروست کرد، دوای دانیشتنی پادشا ئیسماعیل لەسەر تەختی دەسەلاَت و تاجدارکردنی لەتەبرێزدا، بڕیاریدا مەزهەبی شیعە مەزهەبی فەرمیی وڵات بێ و خۆیشی دانا بەجێبەجێکاری فەرمانی دوانزە ئیمامەکە و ئاماژەی دا

بــەوەی لەخـــەودا ئیمـــام مەهـــدیی بینیـــووەو تـــاجێکی ســـووری کردووەتەسەری و فەرمانی جیهاد کردنـی پـێ داوە[1]، هـەروەها وتـی کـە هـەموو کارەکـانی لەفـەرمانی دوانـزە ئیمامەکـەوە سەرچـاوە دەگرێت[2].

## دووەم: هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی فراوانبوونەوەی سەفەوییەت

لـەدوای رووخـانی دەوڵـەتی ساسـانیی لەسـەر دەسـتی عەرەبـە موسڵمانەکان، ئێران بۆ ماوەیەکی زۆر لـەدابڕان و دابەشـبووندا ژیـا، لەو ماوەیەدا لەناوچە جیاوازەکانی ولاّتدا زۆرێك حکومەت دەرکەوتن و شەڕێکی بـەردەوامیان لەنێوانـدا دروسـت بـوو، کـەس نەیـدەتوانی بەیەکجاری زاڵبێت و قەوارەیەکی یەکگرتوو لـەئێران دروسـت بکـات، سەفەوییەکانی سەرەتا دڵنیـابوون سـەختە نیشـتیمانێکی یـەکگرتوو دابمـــەزرێنن و لـــەولاّتێکی پەرتـــەوازەو دابەشـــبووی مەزهـــەبی و نەتەوەییـدا گـەلێك پێکبهێـنن، بۆیـە دەسـەلاّتی روحیـی خۆیانیـان بەکارهێنا بەو پێیەی یەکێکن لەقوتبـەکانی بنەماڵە سۆفییەکان کـە ئەوکات لەتەواوی ئێراندا بلاّوببوونەوە، جا لـەپێناو یەکخسـتنی ئـەو ولاّتـەدا ئـەو دەسـەلاّتە روحییـەی خۆیانیـان بـەکاربرد، هـەروەها

[1] – الصلة بين التصوف والتشيع، كامل مصطفى الشيبي، ص٣٨٨.

[2] - إيران عصر صفوي(إيران في العصر الصفوي)، راجر سيوري، ترجمة كامبيز عزيزي، طهران، نشر المركز، الطبعة الثامنة، عام١٩٩٩، ص٢٦.

لەسایەی یەکبوونێکی مەزهەبییەوە هەوڵی دامەزراندنی یەکێتییەکی نیشتیمانییان دا[١].

دوای ئەوەی لەنیوەی سەدەی سیانزەو مەغۆل چووە ئێرانەوە دەوڵەت بێ توانا بوو لەبەرپەچدانەوەی ئەو شەپۆلە پەلهاوێژراوەی سوپاکان، کە تەواوی شوێنەکانیان داگیرکردو تەنیا کوشتن و کاولبوونی بەدواوە بوو، ئەوەی بۆ گەلانی ئیسلامیی مایەوەو لەنێویشیاندا فارسەکان، ئەوە بوو رووبکەنە جیهانی دونیا بەکەمگرتن، واتا تەصەوف نوێنەری سەرەکیی گەلانی ئیسلامیی بوو لەو کاتەدا، شتێکی خستە بەردەمیان ئازاری خۆیانی پێ کەم بکەنەوەو ترسیان کەم ببێتەوەو دوای بینینی ئەو هەموو دیمەن و وێنە ترسناکانە ئومێدیان بۆ بگەڕێتەوە، لەهەموو شوێنەکاندا خانەقاکان کرانەوەو بەموردیدو شوێنکەوتەکان ئەڵقەو دانیشتنەکان پڕ بوونەوە[٢].

لەسایەی ئەو شپرزییە سیاسیی و کۆمەڵایەتییە باوەی ئەوکات، کۆمەڵگەی ئێرانیی بەشێوەیەکی بنەڕەتییانە تێکەڵ بەو چوارچێوە سۆفیگەرییە دەبوون کە لەماوەیەك پێش دروستبوونی دەوڵەتی

---

[١] - نقش مذهب در روابط إيران وعثماني در عهد صفويه از آغاز تا ابتداي سلطنت شاه عباس(دور المذهب في عهد العلاقات الإيرانية العثمانية من أول الصفوية إلى حكم الشاه عباس)، داود شامي، رسالة ماجستير في فرع تاريخ الإسلام، جامعة اصفهان،(٦اكتوبر/ تشرين الأول٢٠٠٦).

[٢] - سيرى در تصوف وعرفان إيران(نظرة في التصوف والعرفان الإيراني)، محمود عبد الصمدي، ص٥٦- ٥٧.

سەفەوییەت لەتەواوی ئێراندا بلاّوبویەوە، بۆیە تێبینیی دەکرێت کە ئەو بلاّوبوونەوە بەرفراوانەی سۆفیگەریی لەئێراندا، یەکێك بووە لەگرنگترین تایبەتمەندییەکانی ژیانی روحیی درێژایی سێ سەدەی نێوان داگیرکاریی مەغۆل و بەدەسەلاّتگەیشتنی سەفەوییەت.

بەپشت بەستن بەوەی رایبوورد، گرووپی سۆفییەت یان تەصەوف، لەسەدەی چواردەو پانزەدا بلاّوبونەوەیەکی بێ وێنەی هەبووە، لەهەموو شوێنێکدا خانەقاو گۆشەکان دروستکران و پادشایان لەسەرۆکی تەریقەتە سۆفییەکان خۆیانیان نزیکخستووەتەوە تاوەکو پالّپشتیی حکومەتەکانیان بکەن و جەماوەرێتییان فراوانبێتەوە.

رەنگە زۆرترین واتایەك کە لەمومارەسەی ئایینیی لای خەلّك دەرکەوتبێ، ئەو رێزو گەورە راگرتنەی بەرانبەر شێخی تەریقەتەکان بووە کە نمونەیەکی جیاوازی مرۆییان پێشکەشکردووە لەسیستەمی پێوەرە کۆمەلاّیەتییەکاندا، ئەوەش لەگەشەی(برایەتی سۆفییەت)دەرکەوتووە، لەو ماوەیەدا خانەقاکەی لەشاری ئەردەبیل دەرکەوت و گرنگترین رۆلّێکی هەبوو لەسەر رووداوەکانی دواتر، کە تەریقەتێکی نوێ لەو خانەقایەوە دروست بوو سەر بەصەفیەدینی ئەردەبیلیی بوو(ك١٣٣٤ز) کە جەماوەرێتییەکی گەورەی پەیداکردو، سەروەتێکی زۆری دەستکەوت و رێگەی بۆ نەوەکانی کردەوە شکۆی خۆیان بوونیات بنێن و دەولّەتەکەیان دابمەزرێنن.

سەرۆکایەتیکردنی تەریقەتی سەفەوییەت بۆ منداڵەکانی صەفیەدین گوازرایەوە، بەوەش دڵسۆزی و شوێنکەوتەیی بۆ تەریقەتەکە گۆڕا بۆ دڵسۆزی و شوێنکەوتەیی بنەماڵەکە(لەتەریقەتی سەفەوییەتەوە بۆ بنەماڵەی سەفەوییەت)[1].

تەریقەتی سۆفییەت لەماوەی شێخ صەفیەدینی ئەردەبیلییەوە هەڵوێستێکی بەرهەڵستکارانەی دژ بەحکومەتە ستەمکارەکان گرتەبەر، سۆفییەکانی سەر بەتەریقەتی سەفەوییەت هاوبەشی ئازارو ئومێدی خەڵکەکەیان دەکردو خۆیانیان لەکۆمەڵگەو کێشەکانی خەڵك دانەبڕی وەك لەبیروباوەڕی سۆفیگەرییدا هەیەو ئەزانرێ.

خانەقای شێخ صەفی و نەوەکانی پەناگای هەموو ستەملێکراوێك بوو کە بیویستبایە بەرگریی لەمافی خۆی بکات، شێخەکانی سەفەوییەت توانایەکی مەعنەوی و کۆمەڵایەتییان لای شوێنکەوتەی تەریقەکانیان دەستخست، یارمەتیدەری ئەوەش ئەو هێزە کاریزماییەیان بوو کە لەنێو خەڵکدا هەیانبوو، بەوەی سەید گەلێکی ئایینیی پیرۆزن و لەدونیا بەکەمگرتن و خۆگرتنیان لەبەرگی جوان و خواردنی خۆشەوە سەرچاوەی گرتووەو بەپێی بۆچوونی شوێنکەوتەکانیان ئەو شێخانە خاوەن توانستێکی خوایین[2].

---

[1] - جستجورد تصوف إيران(البحث عن تصوف إيران)، عبد الحسين زرين كوب، ص٢٣٢.

[2] - صفوة الصفا، ابن بزاز، تصحيح وتحقيق:غلامرضا طباطبائي مجد، الطبعة الثانية، طهران، عام١٣٧٦، ص٨٨.

هەروەك گێڕانەوە مێژووییەکان ئامـاژەی پـێ دەدەن، ناوبـانگیی شێخە سۆفییەکان گەیشتبووە ئەوپەڕی خاڵەکانی وڵاتـی ئـەنادۆڵ و شام[1]، جا بەتێپەڕبوونی رۆژگارو لەگەڵ زیاتربوونی ژمـارەی موریـدی شـێخەکانی سـەفەوییەت، ئـەو دیـاری و نـەزرو سـەروەتە زۆرەیـان بەسەردا کەڵەکـەی کـرد کـە دەکرایـە دیـاریی خانەقاکـە، توانایـەکی دیکـە بـۆ سـەفەوییەکان پێکهـات، ئـەویش ئـەو توانـا سیاسـی و کۆمەڵایەتییـە بـوو کـە بـۆ داهـاتوو بوویـە هـۆی سـەقامگیریی حکومەتێکی سیاسیی بۆ سەفەوییەکان[2].

لەسـەردەمی جونەیـدا کـە سـەرکردایەتیی تەریقەتەکـەی گرتەدەست لەساڵی١٤٤٧ز، لەسەردەستی ئەو، تەریقەتەکە گـۆڕا بـۆ بزووتنەوەیـەك کـە سرووشـتی سیاسـیی بەسـەردا زاڵهاتـەوە، هاوسەردەمەکانی تێبینییان کرد"لەسـەر رێگـەو شـێوازی پادشـایانە نـەك تەصـەوف"موریدەکانیش لەتـەواوی وڵاتـی رۆم و عەجـەم و شوێنەکانەوە دەهاتنەلای[3]، پاشـان رۆڵـی سـەرکردەیەکی بـەرزخواز هات، ئـەویش ئیسـماعیل بـوو، کـە تـوانیی ئـەو دامـەزراوە ئایینییـە خـاوەن ئامـانج سیاسـییە بگـۆڕێ بـۆ بزووتنەوەیـەکی سیاسـی و

---

[1] - تاریخ عالم آرای امیني، فضل الله روزبهـان خنجي، تصـحیح وتحقیـق: محمـد اکبر عشـیق، طهـران، منشورات میراث مکتوب، الطبعة الأولى، ص٢٦١.

[2] - هویت سیاسـی دولـت صـفوی(الهویة السیاسـیة للدولـة الصـفویة)، محسـن بهـرام نجـاد، في مجموعـة مقالات"إیران عبر التاریخ"، جامعة تبریز، ١٣٨٣هـ/ ١٩٦٢م.

[3] – دائرة المعارف الإسلامیة الشیعیة، ماد الصفویین، مصطفى کامل الشیبي، مج٣، ص٢٢٠.

لەڕیزەکانیدا هێزێکی سەربازیی بەرفراوانی هۆزە تورکمانەکان کۆبکاتەوەو لەنێو ئێراندا بیکاتە هێزی زاڵ و پایتەختی هێزی بنەماڵەکانی تر بگرێ و دەوڵەتە کۆنەکانی وەك تەیموری و بنەماڵەکانی تر نەهێڵێ.

شا ئیسماعیل توانی هەوڵی باوپیرانی بەکاربهێنێ کە زۆربەیان بەکوشتن کۆتاییان پێهاتبوو، لەکۆتاییەکانی سەدەی پانزە(١٤٩٤ز) دوڵەتێکی بەهێزی دامەزراندو بۆ زیاتر لە دوو سەدە بەردەوام بوو، لەکۆی رووداوەکانی ئەو سەردەمەدا کاریگەریی گەورەی هەبوو، شا ئیسماعیلی سەفەوی(ك١٥٢٤ز) لەساڵی١٥٠١ وەك شایەکی یەکخەری ئێران خۆی راگەیاندو ئەیڕوانیە فراوانکردنی هێزی خۆی لەخاکی ئیسلام لەڕێگەی ئەنادۆڵ و عێراقەوە، ئەوە بوو کە پێکدادانی بۆ دروست دەکرد لەگەڵ گەورەترین هێزێکی ئیسلامیی لەڕووی سەربازی و سیاسییەوە لەوکاتەدا، ئەویش هێزی دەسەڵاتی عوسمانیی بوو.

شا ئیسماعیل سەرباری تەمەنی بچووکیشی، توانی لەماوەیەکی زۆر سەختدا دەسەڵاتی ئێران و تەنانەت عێراقیش بکات.

بۆیە ئەو تەریقەتە سۆفیگەرییەی کە شێخ صەفیەدین دایمەزراند، پاڵپشتی ئیسماعیل بوو بۆ دامەزراندنی بنەماڵە پادشایەتییەکەی، سەرەڕای ئەو شکستەشی کە لەلایەن عوسمانییەکانەوە بەسەریدا هات، بەلاّم بنەماڵەی سەفەوییەت

توانیی لەژیاندا بەردەوام بێ و لەهەندێ ماوەی دواتردا شکست بەعوسمانییەکان بگەیەنێ، ئەوەش بەهۆی ئەو بناغە کۆمەڵایەتییەی کە لەتەواوی ناوەندە جیاوازەکانی ئێراندا هەیبوو لەنێو زاناو جوتیارو سەربازان و خەڵکانی تر، بەتایبەت زۆربەی موریدەکانی سەفەوییەت لەو خەڵکە عەشایەرو هۆزانە بوون کە لەئەنادۆڵەوە هاوڕێیەتیی شێخ جونەیدیان کردبوو لەگەڵیدا هاتبوون و شێخەکانی تەریقەتی تەصەوف و گەورەکانیان پیرۆز دەزانی و دەرئاسایانە بۆیانیان دەڕوانی.

هەروەها سەفەوییەکان بەبانگەشەی سەیدێتی و گەڕانەوەی رەچەڵەکیان بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) لەوەی کوڕەزاو وەچەی ئیمام موسای کازمن، توانیان جەماوەرێتیی و خۆشەویستییەکی بەرفراوان بەدەستبخەن لەلایەن ئێرانییەکانەوە، هەروەها بانگەشەیان کرد کە نوێنەری پێشەوای خاوەن زەمانن کە بەپێی شیعە لەژێر پەردەی غەیبدا دەژێ.

پادشا ئیسماعیل بانگەشەو پڕووپاگەندەی کرد، کە نوێنەری ئیمامی حوججەتەو ئیمام ئەوی راسپاردووە مەزهەبی شیعە زیندوو بکاتەوەو بەو پڕووپاگەندەیەش توانی متمانەی خەڵك وەربگرێ و لەتەواوی ناوچەکانی ئێراندا پشتگیرییەکی جەماوەریی دەستبخات[1].

---

[1] - إيران در روزكار شاه إسماعيل وشاه طهماسب صفوي(إيران في عهد شاه إسماعيل وشاه طهماسب الصفوي)، امير محمد بن خواند مير، ترجمة: غلامرضا طباطبايي مجد، طهران، مؤسسة الدكتور محمود افشار، عام١٩٨٠، ص١٢٦.

**سێیەم: هۆکارە سیاسییەکان**

لەهاتنی ئیسلامەوە بۆ وڵاتی فارس، هەندێ دەوڵەتی تورکمانیی لـەو وڵاتـەدا دەرکـەوتن، ئـەو دەوڵەتانـەش: دەوڵـەتی غەزنـەوی و دەوڵەتی ئیلیخانی و دەوڵەتی سەلجوقی و دەوڵـەتی ئـاق قویونلـو و دەوڵەتی قەرە قویونلو و دەوڵەتی سەفەوییەت و دەوڵەتی ئەفشـاری و دەوڵەتی قاجاریی بوون، زۆربەیان ئازەربێجانیـان کـردە پایتـەخت لەرووی بەڕێوەبردن و سەربازی و رۆشنبیرییەوە[1].

کـە ئێلیخانییـەکان نەمان(وەچـەکانی مـەغۆلی ئێـران)، هەنـدێ فەرمانـدەو والی لەویلایەتـەکانی ئێرانـدا بـۆ خۆیـان سـەربەخۆییان وەرگـرت، هـەروەك هەنـدێ بنەماڵـەش دەرکـەوتن و لـەنێو خۆیانـدا ویلایەتەکانیان دابەشکرد، گرنگترین ئەو بنەماڵانـەش ئەمانـە بـوون: جەلائیرییـەکان(١٣٣٦- ١٤١١ز)، موزەفەرییـەکان(١٣١٣- ١٣٩٣ز) نـــەوەی ئینجـــو لـــەفارس(١٣٠٣- ١٣٥٧ز)ســـربدارەکان لەخۆراســـان(١٣٣٧- ١٣٨١ز)، پادشـــایانی کـــرت(١٢٤٥- ١٣٨٣ز)ئاقیونییـــەکان(١٤٠٣- ١٥٠٨)، قـــەرەقویولوەکان(١٣٨٠- ١٤٦٩).

تەیمور لەنگ(ک١٤٠٥ز) لەرێگەی فتوحاتـە گەورەکانییـەوە تـوانی دەوڵەتەکەی(دەوڵەتی ئەودیوو رووبار-ما وراء النهر) بکاتە پـرۆژەی

---

[1] - الصفويون والدولة الصفوية، فوزي توركر، مجلة ديوان العرب، يناير(كانون الثاني)٢٠٠٧.

ئیمپراتۆرییەتێکی بەرفراوان لەدلهییەوە درێژبێتەوە بۆ دیمەشق و لەدەریاچەی ئارلەوە بۆ کەنداوی بەسرەو سەمەرقەندیش ببێتە پایتەختی ئەو ئیمپراتۆرییەتە نوێیە، بەلاّم ئەو سەربازییە بێ وێنەییە نەیتوانی ئیمپراتۆرییەتێکی رێك و تۆکمە دابمەزرێنێ، دوای مردنی تەیمورلەنگی سەرکردەی سەربازی، جێگرەوەو شوێنگرەوەکانی نەیانتوانی رێگریی بنەماڵەکان بکەن تاوەکو نەگەڕێنەوە دەسەلاّتی ناوچەکانی جارانیان، بەڵکو بەخۆیان بوونە یەکێك لەبنەماڵە فەرمانڕەواکانی باکووری ئێران و سەدەیەك لەفەرمانڕەوایی خۆیاندا بەردەوام بوون.

دوای ئەوەی ئیمپراتۆرییەتی تەیمورلەنگ لەدوای مردنی تەیمور لەنگ پارچە پارچە بوو، دوو هۆزی تورکمانیی لەئێراندا نیشتەجێ بوون، ئەوانیش(قەرە قویونلو)واتا خاوەن کاوڕە رەشەکان و، (ئاق قویونلو) خاوەن کاوڕە سپێیەکان بوون، ئەوکات پەشێویی ئێرانی داپۆشیبوو، لەنێو ئەو دوو هۆزەدا شەڕ بەردەوام بوو[1]، بەدرێژایی سەدەی چواردەو پانزە ململانێی سەر دەسەلاّت لەنێو کۆمەڵە بەهێزەکاندا بەردەوام بوو، تاوەکو ئیسماعیلی سەفەویی دەرکەوت، ئیتر بنەماڵە دەسەلاّتدارە پەرتەوازەکان نەیانتوانی لەبەردەم

[1] - تاريخ الصفويين وحضارتهم، بديع جمعة وأحمد الخولي، القاهرة، دار الرائد العربي، ١٩٧٦م، ص٣-١٢.

دەمارگیریی هەڵچووی نوێدا خۆیان بگرن کە لەسەفەوییەکاندا خۆی دەبینییەوە.

شا ئیسماعیل لەماوەیەکی زۆر سەختدا توانی ناوچە گەلێکی بەرفراوانی ناوەڕاست و رۆژئاوای ئێران بخاتەژێر دەسەلاتی خۆی بەهۆی ئەو پەشێوییەی ئەو ناوچانەی گرتبووەوەو حکومەتێکی بەهێز نەبوو لەئامانجە سیاسییەکانیدا کێبڕکێی سەفەوییەت بکات، کشانە بەرزخوازییەکەی بەردەوام بوو تاوەکو لەچاڵدێراندا(شاڵدیران) شکستی هێنا لەبەردەم عوسمانییەکان کە لەو سەرکردە گەنجە تۆقیبوون و پشتیان بەستە چەکە ئاگرینەکان، لەوانەش تۆپ بوو، سوپای ئیسماعیلیان تێکشکاند کە بەشمشێرو چەکی سەرەتایی شەڕیان دەکرد[1].

عوسمانییەکان لەبەر هۆکار گەلێك بەردەوام نەبوون لەتەواوکردنی سەرکەوتنەکەیان و راوەدوونانی پاشماوەی سوپای دۆڕاوی سەفەویەت و داگیرکردنی ئێران، گرنگترین هۆکارەکان: سەرقاڵبوونیان بوو بەفەتحی ئەورووپاو شەڕی بەردەوامیان لەگەڵ دەوڵەتانی ئەورووپای هاوسێ، ئارەزوو نەبوونیان بەفەتحکردنی ئێران و داگیرکردنی بەهۆی زاڵبوونی سرووشتی بیاباناویی لەزۆربەی

---

[1] - الصلة بين التصوف والتشيع، مصطفى كامل الشيبي، ج٢، ص٣٦٦- ٣٦٧.

خاكەكەی و نەبوونیی هیچ بەرژەوەندییەكی ئابووری و سیاسیی گرنگ بەنیسبەت عوسمانییەكانی ئەوكاتەوە.

عوسمانییەكان وەهایان تێڕوانین كرد كە لەجەنگی چاڵدێراندا بابەتی سەفەوییەت كۆتاییهاتووەو جارێكی تر ناتوانن هەستنەوە، ئەوەش بوو رێگەی بەسەفەوییەكان دا هەناسە وەرگرنەوەو هێزیان بهێننەوە بەر. ئەگەرچی شا ئیسماعیل نەیتوانی ئەو شۆكە قبوڵ بكات، بەتایبەت دوای ئەوەی ژنەكەی دیل كەوت و لەسەر عەرەقخواردنەوە ئالوودەبوو تاوەكو مرد ئازاری ئەو دۆڕانەی ئەچەشت[1].

سەفەوییەكان هەوڵی نیگەرانیی دروستكردن و پەشێوییان دەدا لەناوچەكانی فەرمانڕەوایی عوسمانیدا بۆ ئەوەی لاوازی بخەن، بەپشت بەستن بەشیعەكانی ئەو ناوچانە بەئامانجی وەرگرتنی دەسەلاتی جیهانی ئیسلامی، ئەو كارە بوو كە بووە هۆی ئەوەی عوسمانییەكان شیعەكانی ناوچەكانی سنووری ئێران پاكتاوبكەن[2].

---

[1] - انقلاب الإسلام بين الخواص والعوام، محمد عارف اسهناقچي پاشازادة، منشورات دليل، قم، الطبعة الأولى، ص١١٢.

[2] - نقش مذهبدر روابط إيران و عثماني در عهد صفويه از آغاز تا ابتداي سلطنت شاه عباس(دور المذهب في العلاقات الإيرانية العثمانية من أول الصفوية إلى حكم شاه عباس)،داود شاهي، رسالة ماجستير في فرع تاريخ الإسلام، جامعة اصفهان.(٦ اكتوبر/ تشرين الأول٢٠٠٦م).

نەخشەی سیاسیی ئەوکات لەهەموو روویەکەوە یارمەتیدەری دروستبوونی دەوڵەتی یەکگرتووی سەفەوییەت بوو لەئێراندا.

## چوارەم: هۆکارە ئابوورییەکان

لەپێش حکومەتی سەفەوی، ئێران رووبەڕووی کۆمەڵێ کێشە هاتبوویەوە، هەمیشە لەبەردەم ئەگەری شەڕو کاولبووندا بوو، لەلایەن تورکە غەزنەوی و سەلجوقییەکان و جەنگیزخانی مەغۆلییەوە رووبەڕووی پەلامار بوویەوە، داگیرکەران وڵاتەکەیان کاولکردو درندانە هەزارانیان کوشت و زۆرێك خەڵکیان لەخاکی خۆیان ئاوارە کرد، ئاشکرایە کە سەربازەکانی مەغۆل دەچوونە دێهاتەکان و باجی قوورسیان لەخەڵك دەسەند و سەروەتەکانیان دەدزی و لەماڵەکانیاندا بەکەیفی خۆیان هەڵسوکەوتیان دەکرد، جا لەبەر ئەو هۆکارو بارودۆخانەی کە ساڵانێکی زۆر لەئێراندا درێژەی کێشا، گەلی ئێران تینوو بوون بۆ حکومەتێکی بەهێزی دادپەروەر تاوەکو خۆیان بدەنە پەنای و هەست بەئارامی و سەقامگیریی بکەن.

برسێتی و هەژاریی وڵاتی داگرتبوو، گەل لەژێر ستەم و زۆرداریيدا ناڵەی دەهات، جا یەکێك لەهۆکارەکانی کەمکردنەوەی ئەو فشارە بەهێزانە، پەنابردنەبەر بیرو ئامۆژگاریی تەصەوف بوو، سۆفییەکان ئەوکات خەڵکیان فێری ئارامگری و گرنگی نەدان بەئازارو ناخۆشییەکانی دونیا ئەکرد، جەختیان دەکردەوە لەسەر وازهێنان

لەڕواڵەت و گرنگیدان بەناخ و هەڵگرتنی کۆست و ناخۆشییەکان، چونکە لەناخەوە هێزی ڕوحیی دروست ئەبێ و بەوەشەوە مرۆڤ دەتوانێ بەسەر کێشەو ناخۆشییەکانیدا زاڵبێ، جا لەبەر ئەو هۆکارانە، سۆفیگەریی زۆرێك خەڵکی بۆلای خۆی ڕاکێشا، گۆشەو خانەقای سۆفییەکان بوونە سەنتەری خزمەتکردن و هاوکارییکردنی تەواوی تاکەکانی گەل، لەم لایەنەوە گەورە شێخەکانی تەصەوف بوونە خۆشەویسترین کەسێکی لای خەڵك، کە گەورە سۆفییەکانی سەردەمانی خۆیان بوون و خەڵك ڕێزیان لێیان دەگرت و پیرۆزیانیان دادەنا.

خانەقای شێخ صەفییەدینی ئەردەبیلی، بووە سەنتەرێکی میللیی بەهێز، کاتێکیش شێخە سۆفییەکانی سەردەم شێخ جونەیدو دواتری، ویستیان هێزێکی سەربازیی پێکبهێنن، زۆرێك هەژارو کەسانی بێ بەشی کۆمەڵگەکەیان پەیوەندیان پێوەیان کردو بەخێراییەوە مەزهەبی شیعەیان قبوڵکرد، بەو باوەڕەیان کە عەدالەت ئامانجێکی سەرەکیی گرنگە لەمەزهەبی شیعەداو لەحکومەتە ستەمکارو زۆردارەکان ڕزگاریان دەکات[1].

بەوشێوەیە خەڵك پشتگیریی حکومەتی نوێی سەفەوییەتیان کردو بەهێزو ئازایەتییەوە بەرگریان لەپادشا ئیسماعیل دەکرد کە جارێك تەمەنی چواردە ساڵان بوو، ئەو پادشا لاوەیان بەڕزگارکەری

[1] - شاه إسماعیل أول، منشورات شرکت سهامی انتشار، الطبعة الأولی، ١٣٧٥، ص١٠٢.

خۆیـان و پەناگەیـەکی بـەهێز دادەنـا لەبـەردەم پـەلامارەکانی تورکەکان و مەغۆل و تەیموری و ئۆزبەکییەکان.

بەڵگە بۆ ئەوەش، کاتێك پادشا ئیسماعیل لەخۆراساندا لەگەڵ ئۆزبەکییەکاندا شەڕی کرد، فەرمانی بەوەزیرەکەی دا کە میر یار ئەحمەدی ئەصفەهانیی ناسراو بەئەستێرەی دووەم بوو کە لەهەرکوێدا پێیان گەیشت سەربازە ئۆزبەکییەکان بکوژێ ، دوای ئەوەی قەڵای(القرشی) پایتەختی ئۆزبەکییەکانی فەتحکردو هەموویانی کوشت، وتی: ئێستا دڵم ئاوی خواردەوە، چونکە تۆڵەی ئەوانەم کردەوە کە جەنگیزو تەیمور ئەوانیان کوشت[1]، ئۆزبەکییەکان لەبارەی ئەو جەنگەوە وتوویانە"ئەوە قەزاو قەدەر بوو ئەو تاقیکردنەوە رەشەی خستەسەرمان، وەك تۆڵەیەك بۆ ئەو قەسابخانەو کوشتارکردنەی بەفەرمانی جەنگیزو تەیمور ئەنجامدرا، سزایەکی حەق بوو، ئەو ئیسماعیلەش وەك دەجال بوو لەرق و تووڕەیی توندی لەسەرمان"[2].

لەڕوویەکی ترەوە، ئەورووپییەکان لەو ماوەیەدا روویانکردە ئێران، چونکە عوسمانییەکان بەگرتنی قوستەنتینییە لەساڵی(١٤٥٣ز) رێگەی بازرگانیی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوایان بڕی، بۆیە ئەورووپییەکان رێگەی ئێرانیان گرتەبەر بۆ لێدانی

[1] - عالم آراي صفوي، المؤلف المجهول، منشورات بنياد فرهنك إيران، طهران، ١٩٧٠، ص٣٧٢.
[2] - عالم آراي صفوي، ص٣٧٥.

عوسمانییەکان و کردنەوەی ڕێگەی بازرگانی، لەکاتێکدا عوسمانییەکان بیریان چووبووە سەر داگیرکردنی خاکە دەوڵەمەندەکانی ئەورووپا زیاتر لەوەی بیربکەنەوە لەخاوەنداریکردنی بیابانەکانی ئێران، بۆیە لەجەنگیان لەگەڵ ئەورووپا بدۆڕانایە یان لەجەنگی ئەورووپا ببونایەتەوە ئەوجار ڕوویان دەکردە شەڕکردنی ئێران[1].

کۆی هەموو ئەو هۆکارانە، زەمینە سازییەکی گونجاویان کرد بۆ حکومەتی سەفەوییەت و شا ئیسماعیلی سەفەویش توانی لەماوەیەکی کورتدا حکومەتێکی بەتوانا دابمەزرێنیّ و جەماوەرێتییەکی بەرفراوان لەنێو خەڵکدا دەستبخات و پێچەوانەکارانی سەرکوت بکات.

ئەگەرچی سوڵتانی عوسمانی لەشەڕی چالدێراندا شکستی پیّ هێنا، بەڵام حکومەتەکەی و مەزهەبی شیعە کە کردیە مەزهەبی فەرمیی وڵات، لەئاستێکدا بەرفراواندا جەماوەرێتییان هەبوو کە هەرگیز نەلەرێتەوەو جێگرەوەکانیشی توانیان لەفەرمانڕەواییدا بەردەوام بەو توانای حکومەتی سەفەوییەت زیاتر بکەن تاوەکو ببێتە ڕکەبەرێکی ڕاستەقینەو بەهێز لەبەردەم ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی سووننە مەزهەبدا.

---

[1] - مسعود موسوي شفايي، تحولات روابط إيران وعثماني، مجلة كزارش كفت وكو، العدد١٥، بهمن واسفند١٣٨٥ش.(فبراير/ شباط ومارس/ أزار٢٠٠٧)،ص٢٢– ٢٤.

# سەفەوییەت و عوسمانی..... شەڕی ئایدیۆلۆجیای تایەفی

"د. موشتاق عەبدولمەناف ئەلحلو*"

عوسمانییەت و سەفەوییەت بەگرنگترین ئەو بنەماڵانە دادەنرێن کە لەمێژووی موسڵماناندا فەرمانڕەواییان کردووە، جا لەبەرئەوەی عوسمانییەت بووەتە هێمای ئیرادەی سیاسیی سوننەو سەفەوییەتیش ئیرادەی سیاسیی شیعە، ئەوە قسەکردن لەسەر باکگراوندە ئایینییەکانی هەردوو بنەماڵەو ڕۆڵی بیروباوەڕی ئایینیی لەپێکهێنانی بڕیارەکانیاندا لەوپەڕی گرنگیدایە، بەتایبەت هەردوولا لەبەڕێوە ڕۆیشتنی سیاسەتەکانیان لەچوارچێوەیەکی بەرفراواندا خیتابی ئایینییان بەکارهێناوە، بۆیە ئەم چەند لاپەڕەیەم تایبەت کردووە بەلێکۆڵینەوەی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا،

* – نووسەرو لێکۆڵەری عێراقی.

**بەباسکردنی کورت و پوختی مێژووی هەردوو بنەماڵەو خاڵە لێکجیاکەرەوەکانی مێژوویان و پەیوەندییەکانیشیان.**

لەدوای خیلافەی راشیدی و ئەمەوی و عەباسی، بنەماڵەی عوسمانیی بەگرنگترین ئەو بنەماڵانە دادەنرێت کە فەرمانڕەوایی جیهانی ئیسلامیی کردووە، بۆ زۆربەی موسڵمانان خیلافەتی ئیسلامیی نواندووە، بەجۆرێك نەیانتوانیوە نەمانی قبوڵ بکەن، تەنانەت دوای ئەوەی لەشانۆی سیاسیشدا بوونی نەما، لەبیری هەندێ لەموسڵماناندا خەونی گەڕاندنەوەی ئەو خیلافەتە هەر مایەوە.

لەگرنگترین تایبەتمەندییەکی خیلافەتی عوسمانی، فراوانیی خاکەکەی بوو، موسڵمانان بوونی ئەو خیلافەتەیان وەك سیستەمێك دەبینی کە رەوایەتیی شەرعیی بەگردبوونەوە سیاسی و مەدەنییەکان دەدات.

بنەماڵەتی سەفەوییەتیش گرنگییەکەی لەوەدا بوو، یەکەمین بنەماڵەیەك بوو لەدوای ئیسلام بتوانێ ولاَتی فارس یەکبخات و دەوڵەتێکی دروستکرد لێکچووبێ بەحکومەتی نیشتیمانیی لەمڕۆدا کە پشت ببەستێتە هەستی نیشتیمانیی دروست بووی ئەو ولاَتەو دۆخ گەلێکی بابەتیی دیکە، ئەو دەوڵەتە بوو کە مەزهەبی فەرمیی ئێرانی لەسوونییەوە کردە شیعە، کە دوای چوونی ئیسلام بۆ خاکی ئێران ئەو مەزهەب گۆڕینە بەگرنگترین گۆڕانکارییەکانی مێژووی ئەو

وڵاته دادەنرێت که تاوەکو ئـەمرۆش رەنگدانـەوەو دەرهاوێشـتەکانی دەبیـنین و لەئێرانـدا گوێمـان لـەهاوار گەلێکـه داوای گەڕاندنـەوەی شکۆی ئەو وڵاته دەکات[1].

## بنەماڵەو دەوڵەتی عوسمانی

عوسمانییەکان سەر بەهۆزەکانی غزن(ئوغوز)کـه لەگـەڵ شـەپۆلی پەلامارەکانی مەغۆلدا لەنیشتیمانی خۆیان لەمەنگۆلیاوە روویانکردە رۆژئاواو،لەسـالی۱۲۳۷زاینـەوە ئیمـارەتێکی جـەنگییان لەبیتینیا(باکووری ئەنادۆڵ)دامەزراندو دواتر توانیان سـەلجوقییەکان لەناوچـەی ئەنادۆڵـدا دەرپـەڕێنن لەسـەردەمی سـوڵتان عوسمـانی یەکەمـدا(۱۲۹۹– ۱۳۲٦ز) کـه بنەماڵەکـەش نـاوی ئـەوی هـەڵگرت، پاشان بۆ یەکەمجار عوسمانییەکان لەساڵی۱۳٥٤ز چوونه بەلقانەوەو بارەگای یەکەمیان شـاری غـالیبولی بوو(لـەتورکیا)و لەسـەر حسـابی پادشانشینی بێزەنتـه پادشانشـینی ئـەوان فراوانبوویـەوە لـەماوەی فەتحی ئیدرین لەساڵی۱۳٦۱ز و بورسه لەساڵی۱۳۷٦ز.

---

[1] – لەیادی دەرکردنی گۆڤاری"بکاه حوزة"ی دەرچوو لەلایەن(مکتب الاعلام الإسلامي) لەحـەوزەی زانسـتیی قـومی پـیرۆز لەمێـژووی٥موحـەڕەمی۱٤۲۷ک/٤فەبرایـەر،شـوبات)۲۰۰٦ز لەبابەتێکـدا لـەژێر ناونیشانی(نظرية جهان بزرك إيراني)واتا:تیۆری جیهانی گەورەی ئێران نووسەری بابەت ئـەڵێ: کۆمـاری ئیسلامی، دووبارە داڕێژانەوەی سەفەوییەته لەجیهانی نوێدا، لەمەدا داوا دەکرێت و دەخوازرێت ئێران لەجیهاندا رۆڵی خۆی بگێڕێتەوە.

عوسمانییەکان کۆمەڵە یەکینەیەکیان پێکهێنا بەئینکشارییەت ناسرا(زۆربەی ئەندامەکانی خەڵکی بەڵقان بوون) و بەهۆی ئەو هێزە نوێیانەوە توانیان لەبەڵقان و ئەنادۆڵدا خێرا بەرفراوان ببنەوە، بەتایبەت دوای شەڕی نیکبولیس لەساڵی١٣٨٩ز، بەلاّم لەساڵی١٤٠٢ز لەئەنکەرەدا لەبەردەم سوپاکانی تەیمورلەنگدا تووشی شکست هاتن و بەدوای ئەو شکستەدا ماوەیەك شڵەژان و نیگەرانیی سیاسیی بەدوایدا هات بۆ عوسمانییەکان، بەلاّم دەوڵەت هاوسەنگیی خۆی وەرگرتەوەو سیاسەتی فراوانخوازیی پەرە پێدا لەسەردەمی سوڵتان مورادی دووەم(١٤٤٦- ١٤٥١ز)، پاشان موحەممەد فاتیح(١٤٥١- ١٤٨١ز) کە لەساڵی١٤٥٣ز قوستەنتینییەی فەتحکردو کۆتایی بەبوونی بیزەنتەی مەسیحیی هێنا لەو ناوچەیەدا کە چەندان سەدە لەوێدا دەسەلاّتدار بوو، هەوڵی داگیرکردنی باشووری ئیتالیاشیان دا، لەکۆتاییشدا سوڵتان سەلیمی یەکەم(١٥١٢- ١٥٢٠ز) توانی لەجەنگی چاڵدێراندا لەساڵی(١٥١٤ز) بەسەر سەفەوییەکاندا سەرکەوێ و ئازەربێجان بگرێ و فەتحی شام و فەڵەستین بکات لەساڵی(١٥١٦ز) و میسر لەساڵی(١٥١٧)،پاشان دوورگەی عەرەب و حیجاز.

دەوڵەتی عوسمانیی لەسەردەمی سەلیمی یەکەمی قانونیدا(١٥٢٠- ١٥٦٦ز) بەلوتکەی خۆی گەیشت، کە بەردەوامیی دا بەفەتحەکانی بەڵقان و مەجەرو کەشتی گەلی دەریاییشی

دروستکرد بۆ زاڵبوونەسەر دەریای ناوەڕاست(دوای١٥٥٢ز) و پێش گەمارۆدانی ڤێننا لەساڵی(١٥٨٣ز)، سێ دەوڵەتی ڕۆژئاواشی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی: جەزائیرو تونس پاشان لیبیا.

لەساڵی١٦٥٦ەوە دەسەلات کەوتەدەست گەورەی وەزیرەکان(سەدری ئەعزەم)، یان گەورە فەرماندە ئینکیشارییەکان و دەسەلاتی پادشا کەوتە دەست سوڵتان گەلێکی لاوازو لەو ماوەیەدا قۆناغی هەرەسی سەرتاپا دەستپێکرد، دۆخی عوسمانییەکان لەساڵی١٧٠٠ەوە لەدۆخی پەلاماردانەوە کەوتە دۆخی بەرگری، پاشان پەیکەری دەوڵەت داڕێژرایەوە لەسەردەمی سوڵتان سەلیمی سێیەم(١٧٨٩- ١٨٠٧ز) و سوڵتان مەحموودی دووەم(١٨٠٨- ١٨٣٩ز) و دوای ئەویش، بەلام سەرباری ئەوەش، ئەوە دۆخی دەوڵەت لەگەڕانەوە دوواوە بەردەوام بوو، لەساڵی١٨٣٩ز ڕێکارەکان ڕاگەیندرا، چاکسازیی گەلێك بوون بەشێوازی ئەورووپییانە، بەلام سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم(١٨٧٦- ١٩٠٩ز) بەشێوازێکی سەرکوتکارانە ئەو چاکسازییانەی کۆتایی پێ هێنا، لەئەنجامی ئەوەدا هەموو هێزە نیشتیمانییەکانی تورکیا چاوی دوژمنایەتییان خستەسەری تاوەکو لەساڵی١٩٢٢ز کۆتا سوڵتان کە موحەممەدی شەشەم بوو(١٩١٨-١٩٢٢ز)لەدەسەلات لادراو لەکۆتاییشدا کەمال ئەتاتورك لەساڵی١٩٢٤ز بەیەکجارەکیی خیلافەتی هەڵوەشاندەوە، بەوەش

عوسمانییەکان لەماوەی سالآنی۱۲۸۰– ۱۹۲۲ز فەرمانڕەوایی بەلْقان و ئەنادۆلْ و خاکێکی بەرفراوانی دیکەیان کرد.

کەوابوو دەتوانین گەشەو پەرەسەندنی سیاسیی دەولْەتی عوسمانیی بۆ سێ قۆناغ دابەش بکەین: قۆناغی میرایەتی و دامەزراندن(۱۲۸۸– ۱۳٦۲ز)، قۆناغی دەولْەت(۱۳٦۲– ۱۵۱٦ز)، قۆناغی ئیمپراتۆرییەت(۱۵۱٦– ۱۹۲۲ز)، بەپێی هەر قۆناغێکیش پایتەختەکەی گۆڕاوە، لەقۆناغی یەکەمدا پایتەختەکەی یانی سەیر بوو۱۲۸۰–۱۳٦٦ز، پاشان ئیدرنە(ئیدرین)۱۳٦٦– ۱٤٥۳ز)، لەکۆتاییشدا ئەستەنبول(قوستەنتینییە)لەسالْی۱٤٥۳ەوە تاوەکو کەوتنی خیلافەت[1].

## بنەمالّەو دەولّەتی سەفەوییەت

لەنێو مێژوونووساندا سەبارەت بەبنەچەی سەفەوییەت جیاوازیی هەیە، دەستنووسی(صفوة الصفا) کە بۆ"لیدن" دەگەڕێتەوە، باسدەکات کە رەچەلّەکی سەفەوییەت بۆ کوردەکان دەگەڕێتەوە[2]، رەوتە سۆفیگەرییەکەشیان دووپاتی دەکاتەوە کە کورد بوونە،

---

[1] - بۆ خوێندنەوەو شارەزایی زیاتر بڕوانە: أبو الحسن علوي بن حسن عطرجي، الصفويون والدولة العثمانية، پێداچوونەوەو پێشەکی، محمد بن حسن بن عقيل موسى، دار الأندلس الخضراء.

[2] - عباسقلي غفاري فرد، نكاهي به كرفاي تحولات در خاندان صفوية از شيخ صفي تا شاه عباس(نظرة على عمق تحولات في السلالة الصفوية منذ الشيخ صفي إلى السلطان إسماعيل)، مجلة كيهان فرهنكي، اسفند۸۰(مارس/ آذار۲۰۰۲م)، العدد۱۸٥ و ۱۸٦، ص٥۳.

زمانیش جیاوازیی لەبارەیەوە هەیەو بەڕوونیی نازانرێ چی زمانێکیان هەبووە[1]، شافیعیی مەزهەب بوونە(ئەمەش بەڵگەیەکی تری رەچەڵەکی کوردبوونیانە)، یەکەمین کەسێکیان حەزی کردبێ و لایدابێتەوە بەلای شیعەگەرییدا خواجە عەلیی کوڕی شێخ صەدرەدین موسا بووە[2]، نزیکبوونی مێژوویی نێوان سۆفیگەری و شیعەگەری، رۆڵی گرنگی گێڕاوە لەڕووکردنی سەفەوییەکان بەلای شیعەدا.

رەچەڵەکی سەفەوییەکان بۆ شێخ صەفیەدینی ئەردەبیلیی دەگەڕێتەوە(١٢٥٢- ١٣٣٤ز) کە ساڵی١٣٠٠ز لەئەردەبیلدا تەریقەتە سۆفێتییەکەی دامەزراندو ئەردەبیلیش بووە پایتەختی ئایینیی شوێنکەوتەکانی، پاشان پایتەختی سیاسی(لەگەڵ گۆڕینی بۆ بزووتنەوەیەکی سیاسی)، دوای مردنیشی صەدرەدین موسای کوڕی جێی گرتەوە، پاشان کارەکە گوازرایەوە بۆ کوڕەکەی کە صەدرەدین خواجە عەلیی سیاهبوش بوو، ئەو دۆخە نالەبارەی لەسەر دەستی تەیمورییەکان بەسەر ئێراندا هات یارمەتیدەری بوو بۆ زۆربوونی موریدو کۆبوونەوەیان لەدەوریدا، یەکەمین کەسێکی بنەماڵەی سەفەوییەت بوو بووە شیعەو بانگەشەی بۆ شیعەگەریی کرد، ئەوەش بەخاڵی گۆڕانکاریی دادەنرێت لەڕێڕەوی ئەو

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل٥٤.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل٥٥.

بنەماڵەیـەدا، روونـە کـە قبـوڵکردنی مەزهـەب و بیروبـاوەڕێکی نـوێ هۆکارگـەلێکی زۆر و ئـاڵۆزی هەیـەو تـەنیا بـەزەبری هێـز ناکرێـت[1].
سەفەوییەکان سەرکەوتووبوون تاوەکو لەهەندێ ناوچەدا بەدەسەڵات بگـەن لەسـەردەمی سـەرۆکایەتیی جونەیـد(١٤٤٧- ١٤٥٠) و پاشـان سـەردەمی حەیـدەر(١٤٦٠- ١٤٨٨ن) کـە ئـەو دوو کەسـە توانیـان ڕێکخستنێکی سیاسیی دابمەزرێنن و یەکە گەلێکی سـوپا پێکبهێـنن، یـان ئـەوەی نـاودەبرا بـەقزلباش، تـاوەکو سـاڵی١٥٤٨ز تـەبرێز پایتەختی سـەفەوییەت بـوو، پاشـان لەسـاڵی١٥٤٨- ١٥٩٨ قـەزوین پایتـەختیان بـوو، پاشـان ئەصـفەهانیان کـردە پایتـەخت تـاوەکو سەردەمی رووخانیان[2].

پردی پەیوەندییەکانی سەفەوییەت بەوڵاتە جیاوازەکان گەیشـت، وەك هیندو ئۆزبەك و ئەفغان، گرنگترین پەیوەندییەکی خراپ بـووبێ یان باش لەگەڵ سەڵتەنەتی عوسمانیدا بووە، یەکەمین هۆکارێـك کـە پەیوەنـدیی نێـوان ئـەو دوو دەوڵـەتی دیـاریی کردبـێ، بوونیـاتی تەقلیـدی و مەزهـەبیی هـەردوولا بـووە، دژبـوونی تایـەفیی نێوانیـان هەردوولای بەشەڕ گەلێکی وێرانکەر گەیاندو بەپەیماننامـەی قەسـری

---

[1] - بۆ زیـاتر زانیـاری، بڕوانـە:((الأسـباب والخلفیـات لقیـام الدولـة الصـفویة)) و ((سـیرة حیـاة العائلـة الصفویة وملوکها)).

[2] - The New islamic Dynasties: A chronological and genealogical manual ,Clifford Edmund Bos worth. Edinburgh university press,١٩٩٦

شـــيرين كۆتاييهـــات و ســـنووری نێوانيانيـــان ديـــاريكراو لـــەدوای شەڕەكانی دواتريش هيچ گۆڕانكارێك لەسنووریاندا نەكرا.

سەفەوی و عوسمانييەكان كاتێك لەشـەڕی يـەكتر ببوونايەتـەوە، وەك يەك شەڕی رووسيايان دەكرد، بـەلأم هەريەكـەو بـەجيا شـەڕی دەكـردو بيريـان لەيـەككرتن نـەكردەوە، بەپێچـەوانەوە بيريـان دەكردەوە لەگەڵ رووسيادا يەكبگرن دژ بەيـەكتر، لەكۆتاييـدا ئێـران هـەموو ئـەوەی لەسـێ سـەدەدا خـەڵكی لەسـەر دايـە كوشـت، دايـە رووسياو عوسمانييەتيش لەنێو سنووری توركيادا گەمارۆ بوو[1].

### پەيوەندييەكانی سەفەوی– عوسمانی

مێژووی ئێرانی سەفەوی و توركيا عوسمانی، بەمێـژووی ململانـێ و خوێن دادەنرێت، لەشەڕەكانی شـا ئيسـماعيل و سـوڵتان سـەليمدا ململانێی نێوانيان بەلوتكە گەيشت، بەلأم لەسەردەمی فـەرمانڕەوايی نـادر شـادا هەنـدێ عەقڵمەنـدی و دانـايی لەپەيوەندييـەكانی نێـوان هەردوولا هاتەئاراوە، لەئاست هەردوو گەلدا ململانێ بەسەر شتەكاندا زاڵ نەهاتبوو، توركەكان لەئەدەبی فارسيی سووديان كرد، ئێـرانيش لەڕێگەی توركياوە زانستی نوێ فێر بوو كە ئەوكات رێگەی خۆی بـۆ ئەورووپا كردەوە، بەداخەوە ئێران ديكۆمێنتـە مێژووييـەكانی خـۆی

---

[1] - مسعود موسوي شفايي، تحولات روابط إيران وعثمـاني، مجلة كـزارش كفت وكـو، العـدد١٥، بهمـن واسفند١٣٨٥ش، ص٢٢.

پارێزگاریی نەکردووە وەك ئەوەی راپۆرتەکەی دکتۆر موحەممەد ئەمین رەیاحیی باسی دەکات لەکتێبەکەیدا(سفارتنامەهای إیران) و بەهۆکار گەلێکی زۆر ئەو دیکۆمێنتە مێژووییانە لەنێو چوونەو عوسمانییەتیش دیکۆمێنتی خۆی پاراستووە، بۆیە دەکرێ بەپشت بەستن بەدیکۆمێنتی عوسمانی، پەیوەندییەکانی نێو هەردوو وڵات لێکۆڵینەوە بکەین.

یەکێك لەگرنگترین ئەو سەرچاوانە، ئەو راپۆرتانەیە کە سەفیرەکان بۆ حکومەتەکانی خۆیانیان بەرزکردووەتەوە، ئەگەرچی لەو سەردەمەدا باو نەبووە دەوڵەتەکان سەفیری جێگیر بنێرنە وڵاتان، بەڵکو بۆ چارەسەرکردنی کێشەو کارێك سەفیریان ناردووەو دوای تەواوکردنی ئەرکەکەی گەڕاوەتەوە وڵاتی خۆی و راپۆرتێکی نووسیووە لێکچووی یادەوەریی بووەو بەزۆریش زانیاری گەلێك بووە سەبارەت بەو وڵاتەو نەریتی خەڵکەکەشی.

لەدەرکەوتنی دەوڵەتی سەفەوییەتدا، سوڵتان بایەزیدی دووەم جڵەوی سەڵتەنەتی عوسمانیی بەدەست بوو، حەزی بەشەڕ نەبوو، بۆیە دەستپێشخەریی شەڕی نەکردو چاوەڕوانی و وریایی بەسەر پەیوەندییەکانیاندا باڵی کێشابوو، پابەندی مافی هاوسێتیی بوون، لەبارەی بایەزیدی دووەمەوە باسکراوە کە سرووشتێکی ناسك و جوانی هەبووەو حەزی بەوێژەو فەلسەفە بووە، بیری لەفتوحات و شەڕ نەکردووەتەوە، نامەی دۆستایەتیی لەگەڵ سەفەوییەتدا

ئاڵوگۆڕ کردووە، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك لەسەر سنووری ڕۆژهەڵاتی عوسمانی، هەستی بەمەترسیی کردووە، چونکە دەسەڵاتی نوێ تورکمانەکانی لەدژ جوڵاندەوە، لەبەرانبەر ئەو کارەدا شیعەکانی حکومەتەکەی سەرکوتکرد وەك ڕێگرییەك لەبلاوبوونەوەی ئایدۆلۆجیای سەفەوییەت[1].

لەمەی دادێ بەدواداچوونی هەڵکشانی پەیوەندییەکانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتەیە لەماوەی فەرمانڕەوایی پادشا سەفەوییەکاندا:

### ئیسماعیلی سەفەوی(١٥٠١- ١٥٢٤ز)

ئیسماعیلی سەفەوی لەساڵی١٤٩٤ز سەرکردایەتیی ڕێکخستنەکانی گرتەدەست و ناوچەکانی گەیلانی گرت، پاشان لەساڵی١٤٩٩ بۆ ١٥٠١ز فراوانخوازییەکانی بەردەوامیی پێدا کە تەواوی ناوچەکانی ئێرانی دەست بەسەردا گرت، پاشان ساڵی١٥٠٧ز قەرە قویونلوی دەرکردو عێراقیشی داگیرکردو ساڵی١٥٠٨ز چووە بەغداوەو مەزهەبی دوانزە ئیمامی کردە مەزهەبی فەرمیی دەوڵەت، بەڵام لەساڵی١٥١٤ز لەشەڕی چاڵدێراندا لەبەرانبەر عوسمانییەکان شکستیهێنا و شەڕەکانی تری بەدواداهات لەنێوان خۆی و عوسمانییەکان لەسەر سنووری ڕۆژئاوای وڵات و لەگەڵ

---

[1] - بۆ زیاتر زانیاری، بگەڕێرەوە بۆ: أبو الحسن علوي بن حسن عطرجي، الصفويون والدولة العثمانية، پێشەکی و پێداچوونەوەی: محمد بن حسن بن عقيل موسى، دار الأندلس الخضراء.

ئۆزبەکییەکانیش(شـــەیبانییەکان لـــەبوخارا) لەســـەر ســـنووری ڕۆژهەڵات[1].

لەبەرچەند هۆکارێك عێراق بۆ سەفەوییەت گرنگ بوو، هۆکاری سیاسیی لەنەهێشتنی پاشماوەی دەوڵەتی قەرە قویونلو بوو، هۆکاری ستراتیژیش شوێنی عێراق بوو وەك پێکەوە بەستەرەوەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو ڕێگەی ئاورێشم و بازرگانیی ڕۆژهەڵات لەڕێگەی کەنداوەوە، هۆکاری ئابووریش، بەپیتیی خاکی عێراق و داهاتەکانی بوو بۆ خەزێنەی سەفەوییەت، هۆکاری ئایدۆلۆجیای مەزهەبیش کە خۆی دەبینییەوە لەشوێنە پیرۆزەکانی لای شیعە لەنەجەف و کەبەلاو بەغدا.

## شەڕی چاڵدێران(شاڵدیران)

زیاتر لەهەر شەڕێکی تر، ئێمە لای ئەم شەڕە دەوەستێن، ئەوەش بەهۆی ئەو ڕۆڵە میحوەرییەی کە ئەو شەڕە گێڕای لەکێشانی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتی سەفەوییەت و عوسمانی.

کاتێك شا ئیسماعیل، مەزهەبی سەفەوییەتی بەسەر گەلەکەیدا سەپاندو کردیە مەزهەبی فەرمیی دەوڵەت لەئێراندا، پەرچەکرداری ئەو بڕیارە زۆر توونـد بوو، بەتایبەت زۆربەی دانیشتوانی شارە

[1] – هەمان سەرچاوە.

سەرەکییەکانی ئێران نمونەی تەبرێز زۆرینە سووننە بوون[1]، لەبەر ئەوە هەستا بەڕاکێشانی هۆزی قزلباشی عەلەویی تورکی و ئەوانی کردە کۆڵەکەی سوپاکەی، ئەو هۆزانە بێزاربوون لەڕێوشوێنگرتنی دارایی و بەڕێوەبردنی عوسمانی،بۆیە ڕێگەی بۆ کرایەوە پەشێویی گەورە لەئەنادۆڵدا دروست بکات[2].

ئیسماعیل هەموو بەرهەڵستکارەکانی لەنێو دەبرد، هەروەك مەزهەبی شیعەی سەپاندو خەڵکیش بەو هۆیەوە رقیان لێی دەبوویەوە، دەوڵەتی ئاق قویونلو(دەوڵەتی تورکمانی) لەنێو برد کە کەوتبووە نێوان خۆی و عوسمانییەکانەوەو بەپێی پڕوپاگەندەی سەفەوییەکان دەوڵەتە بچووکەکانی کوردو هۆزە تورکەکانی چیای بچووکی توروس و کەمینە مەسیحییەکانی ئەرمینیا مولکی شا بوون[3]، تاوەکو ساڵی١٥٠٨ز بەغدای داگیرکردو گۆڕی پێشەوایانی مەزهەبی سوونەی رووخاندو کۆمەڵێك زانای سەربڕی[4].

پەیوەندیی نێوان سەفەوییەکان و عوسمانییەکان لەو ماوەیەدا ئاڵۆز بوو، لەسەرەتای بەدەسەلاتگرتنی سوڵتان سەلیمی یەکەمەوە، نوێنەرانی بوندوقییەو مەجەرو میسرو رووسیا بۆ پیرۆزبایی کردن

---

[1] - علي محمد الصلابي، الدولة العثمانية عوامل النهوض والسقوط، الطبعة الثانية، بيروت، دار المعرفة، ٢٠٠٥م، ص٢٠٠- ٢٠١.

[2] - فاضل بيات، دراسات في تاريخ العرب في العهد العثماني، رؤية جديدة في ضوء الوثائق والمصادر العثمانية، بيروت، دار المدار الإسلامي ، ٢٠٠٣م، ص١٦.

[3] - ستيفن لونكريك، أربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر الخياط، ط٥، ٢٠٠٤م، ص٣٣.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل٣٢.

گەیشتن و بۆ ماوەیەکی زۆر ڕێکەوتن و ئاگربەستیان لەگەڵدا بەست[1]، بەڵام نوێنەری ئێران نەهات[2].

سەلیمی یەکەم بەچاوی گومانەوە دەیڕوانییە جموجوڵی سەفەوییەکان، بەتایبەت دوای ئەوەی شا ئیسماعیل شاندێکی گەورەی ناردەلای قانصوهی غوریی سوڵتانی میسر کە ٢٠٠ کۆیلە بوو تاوەکو ئاگاداری بکاتەوە لەشەڕی چاوەڕوانکراو و بانگهێشتکردنی بۆ هاوپەیمانێتیی کردن دژ بەسوڵتان سەلیم[3] و وریای کردەوە لەڕێکنەکەوتن لەگەڵیدا، چونکە ئەگەر لەگەڵیدا ڕێك نەکەوێ، ئەوە بەجیا شەڕی عوسمانییەکان ئەکات و دواتریش ئەو لەنێو دەبات[4].

سەلیم پێداگربوو پێش ئەوەی سەفەوییە دوژمنەکانی ئامادەبن لێدانێکی سەختیان بکات، بۆیە شاندێکی ناردەلای مەمالیك و بانگەوازیانی کرد بۆ هاوپەیمانێتیی کردن، بەڵام دوای ڕاوێژکردنێکی زۆر مەمالیکەکان بێ لایەنییان هەڵبژارد ئەگەرچی حەزیان بەسەفەوییەکانیش دەکرد[5].

---

[1] – محمد فريد بك المحامي، سەرچاوەی پێشوو، لا٧٣.

[2] - فاضل بيات، سەرچاوەی پێشوو،لا١٧.

[3] - سەرچاوەی پێشوو،لا١٧.

[4] – محمد فريد بك المحامي، سەرچاوەی پێشوو، لا٧٤.

[5] – هەمان سەرچاوە، لا٧٤.

دوای ئەوەی سولّتان سەلیم لەگەلّ براکانی خۆیدا کێشەکانی چارەسەرکردو ئاشتیی کرد لەگەلّ ئەورووپییە هاوسێکانیدا، بەتایبەت لەگەلّ مەجەر، فەرمانی دا سەرژمێری شیعە بلاّوبووەکانی ولایەتەکانی هاوسنووری ولاّتی عەجەم بکرێ لەرۆژهەلاّتی ئەنادۆل و هەموویان بکوژرێن، ئەوترێ نزیکەی٤٠ هەزار قزلباش بوونە[1]، ئەم قەسابخانە کردنە وەلاّمدانەوەی قەسابخانەی سەفەوییەکان بوو کە بەرانبەر سووننەکانی عێراق و تەبرێزو ئازەربێجان ئەنجامیاندا[2]، هەروەك سولّتان سەلیم دەیەویست پێش رووداوەکان بکەوێ و هیچ هەلّگەرانەوەیەك نەهێلّێ کە بکرێ لەداهاتوودا روویدەن.

پاشان سولّتان سەلیمی یەکەم لە١٩موحەرەمی سالّی٩٢٠ك/ ١٦مارس(ئازار)ی١٥١٤ز لەشاری ئەدرنەدا هەموو زاناو وەزیرو پیاوانی جەنگی کۆکردەوەو باسی مەترسیی ئیسماعیلی سەفەویی بۆیان کرد لەئێراندا، کە دەستدرێژیی کردووەتەسەر سنووری دەولّەتی عوسمانی و لەگەلّ ئەهلی سووننەو جەماعەدا رەگەزپەرستانە مامەلّەی کردووە لەئێراندا، هەروەها لەناوەراستی ئاسیاو هیندو ئەفغانستان، بۆیە وەهای دەبینێ لەسەریان پێویستە بەرگریی لەبراکانیان بکەن لەتورکیاو عێراق و میسرو وەهای ئەبینێ پێویستە جیهادی پیرۆز رابگەیندرێ دژ بەدەولّەتی سەفەوییەت،

---

[1] - فاضل بيات، سەرچاوەی پێشوو،لا١٧٧.

[2] - علي محمد الصلابي، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٠١.

پیاوانی ئایین فەتوای جیهادیان دا[1]، سولتان سەلیمیش هەستا بەکۆمەڵێ ئامادەسازیی ناوخۆیی و دەرەکی و کۆمەڵێ نامە گۆڕینەوە لەپێش جولانەوەی بۆ شەڕکردن.

لەکۆتاییدا لەڕۆژی چوار شەممە ٢رەجەبی٩٢٠ك/ ٢٣ئۆگستس(ئاب)ی١٥١٤ز لەچالدێران شەڕەکە روویدا لەنێوان هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانیی بەسەرکردایەتیی سولتان سەلیم یاوزی یەکەم و هێزەکانی سەفەوییەت بەسەرکردایەتیی ئیسماعیلی یەکەم، شەڕەکە کۆتاییهات بەسەرکەوتنی هێزە عوسمانییەکان و داگیرکردنی تەبرێزی پایتەختی سەفەوییەت، ئەوەش وەهای کرد بۆ ماوەی سەدەیەك پەلکێشان و فراوانخوازیی سەفەویی بووەستێ و عوسمانییەکان بوونە گەورەی شەڕەکەو شۆڕشی عەلەوییەکان لەنێو ئیمپراتۆریەت کۆتاییهات.

شیاوی باسکردنە، پەنابردنی برایەکی سولتان عوسمانیی بۆ ئێران، ئەو بزیسکە بوو کە ئاگری شەڕەکەی هەڵگیرساند.

لەئەنجانی ئەو شەڕەدا، عوسمانییەکان دەستیانگرت بەسەر تەبرێزی پایتەختی سەفەوییەت و ناوچەکانی عێراقی عەجەم و ئازەربێجان و خاکی کوردەکان و باکووری عێراق، پاشان روویانکردە ناوچەرگەی شام و لەشەڕی مرج دابقدا بەسەر مەمالیکەکانی هاوپەیمانی سەفەوییەکانیشدا سەرکەوتن، هەر لەسەرەتای

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل٢٠٢.

شەڕەکەوە تای تەرازووی شەڕەکە بەلای عوسمانییەکاندا بارسەنگ بوو، ژمارەیان زۆرترو چەك و تەقەمەنییان باشتر بوو، لەو شەڕەدا شا ئیسماعیل بریندار بوو، ئەگەر هەڵنەهاتبایە لەنێو دەبراو هەموو ئەوەی هەیبوو بۆ سەلیمی یەکەم و سەربازەکانی بەجێیهێشت، هەروەك تاجلو خانمی خێزانیشی بووە دیلی هێزە عوسمانییەکان[1]، سوڵتان قبوڵی نەکرد بۆ مێردەکەی بگێڕێتەوە، بەڵکو وەك تۆڵەکردنەوەیەك لەشا ئیسماعیل لەیەکێك لەنووسەرەکانی مارەیکرد[2].

سەلیمی یەکەم تەبریزی پایتەختی سەفەوییەکانی داگیرکرد، ئەوەش وەهای لەسەفەوییەکان کرد پایتەختەکەیان بگوازنەوە شوێنێك ئەگەری پەلامادانی کەمتربێ[3].

---

[1] - فاضل بيات، دراسات في تاريخ العرب في العهد الحديث، الطبعة الأولى ليبيا، بنغازي: دار الكتب الوطنية، ۲۰۰۳م.

[2] - محمد فريد بك المحامي، تاريخ الدولة العلية العثمانية، بيروت: دار الجيل، ۱۹۷۷م، ص٧٤.

[3] - ئێرە شوێنی ئەو باسەی لێ نابێتەوە، بۆیە بڕوانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە بۆ باسی دوور و درێژی ئەو شەڕە:

عباس إسماعيل صباغ، تاريخ العلاقات العثمانية الإيرانية: الحرب والإسلام بين العثمانيين والصفويين، ط۱، بيروت: دار النفائس، ۱۹۹۹م، لا١٢٨و دواتری.

– محمد بن أحمد بن اياس الحنفي. بدائع الزهور في وقائع الدهور، القاهرة: الهيئة المصرية العامة، ١٩٨٤م، ج٤، ص٣٨٤.

– نبيل عبد الحي رضوان:جهود العثمانيين لإنقاذ الأندلس في نطلع العصر الحديث، مكتبة الطالب الجامعي، ط١٩٨٨م، ص٤٣٥.

– علي الصلابي، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٠٤.

دوای سەرکەوتن، سولتان سەلیم فەرمانی دا شارەکە چۆڵبکرێ و بازرگان و پیشەوەرو زاناکانی لەگەڵ خۆیدا گواستەوە ئەستانە، مێژووش لەبارەی ئەو خەڵکەوە زۆرمان بۆ ناگێڕێتەوە، بەڵام بێگومان هێنانی ژمارەیەکی زۆری بازرگان و زاناو پیشەوەر لەیەك کاتدا لەکۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر، شوێنەواری کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی بەدواوەیە.

## شوێنەوارەکانی ئەو جەنگە

سەرکەوتنی سەلیمی یەکەم بووە هۆی هەستانی سەرۆکەکانی کوردستان کە سوونە مەزهەب بوون بۆ پشتیوانیکردنی عوسمانییەکان، دڵسۆزی و لایەنگیریی خۆیان بۆ دەوڵەتی عوسمانیی راگەیاندو زۆر تێنەپەڕی ۲۳شار چووە پاڵ فەرمانڕەوایی عوسمانی ئەگەرچی سەفەوییەکان قایمکاریی سەربازییان تێدا کردبوو، سولتان سەلیم ڕێکەوتنی دۆستانەو هاوپەیمانێتیی لەگەڵیاندا کرد، هەموو ئەو کارەش بەهەوڵی شێخ ئیدریسی

---

– أحمد فؤاد متولي، وهويدا محمد فهمي، تاريخ الدولة العثمانية منذ نشأتها حتى نهاية العصر الذهبي، القاهرة، كلية آداب عين شمس:ايتراك للنشر والتوزيع، ص١٨٨.

– محمد فريد بك المحامي، سەرچاوەی پێشوو، لا٧٤.

– فاضل بيات، لا١٨.

بەدلیسیی بوو کە سوڵتان رایسپاردبوو بۆ بەڕێوەبردنی ئەو هەرێمانە، ئەوەش لەبەرانبەر ئەو خزمەتەی بەسەڵتەنەتی کردبوو[1].

خاکی دەسەڵاتی عوسمانییەکان فراوان بوویەوە، سەرکەوتنیان لەو شەڕەدا توانادارییانی کرد دەستبگرن بەسەر رێگە سەرەکییە ستراتیژییەکانی ئەنادۆڵ لەرێگەی قەوقازو سوریاو ئێران[2] و تواناداریکردن هێڵەکانی بەرگری و پەلاماردانی ئەو ناوچانە رێکبخەن و زاڵبن بەسەر رێگە جیهانییەکانی بازرگانیدا، بەتایبەت رێگەی ئاورێشمی فارس لەتەبرێزەوە بۆ حەلەب و بورسە، ئەوەش داهاتێکی گرنگی بۆیان دەستخست و لەکۆتاییدا بەزاڵبوونیان بەسەر سەرچاوەی سەرەکیی بازرگانیی کۆیلە لەقەوقاز، توانیان لەو ماوە گرنگەدا فشار بخەنە سەر مەمالیك[3].

ئەگەرچی چاڵدێران شەڕێکی توونـد بوو سەفەوییەکان تیایدا دۆڕان، بەڵام شەڕێکی یەکلاکەرەوە نەبوو، سنووری ململانێی نێوانیانی نەکێشاو دوژمنیان بۆ یەکتر دەسازاند، دوای شکستی ئیسماعیل و هەڵگەڕانەوەی هەرێمەکانی کوردە سوونەکان لەدەسەڵاتی سەفەوی و وەستانیان لەپشت سوڵتان سەلیمی یەکەم، ئیسماعیل هەوڵی تۆڵەکردنەوەی دەداو هەندێ سەرکردەی قزلباشی هاندا بۆ پەلاماردانی ناوچەکانی ئەرزنجان، بەڵام عوسمانییەکان

---

[1] – عباس أحمد صباغ، سەرچاوەی پێشوو،ل١٣٢.

[2] – أحمد عبدالرحيم مصطفى، في أصول التاريخ العثماني، بيروت: دار الشروق، ١٩٩٨م، ص٨١.

[3] - أحمد فؤاد متولي، تاريخ الدولة العثمانية، ص١٩٤.

ئـەوانیان شکستـپێهێناو دیـار بـەکرو مـاردین [1] و تـەواوی شـارەکانی کوردستانیان داگیرکرد، بەشی زۆری زەوی کوردەکان کەوتە دەست عوسمانییـەکان، هێڵـی یەکلاکـەرەوەی نێـوان هـەردوو دەوڵـەت دیـارییکراو ئـیتر شـتێکی سـەخت بـوو لـەڕووی ڕۆژئـاواوە ئێـران فراوانبێتەوە [2].

ئەنجامـەکانی ئـەو جەنگـە، شـوێن و پێگـەی شـای لەعێراقـدا لەرانـدەوەو بووەهـۆی ئـەوەی عێـراق بچـێتە پـاڵ عوسمانییـەکان [3]، لەئەنجامی کشانەوەی سوڵتان سەلیم لەئێران، شـا لەئێراندا بـەهێزو کاریگـەر مایـەوەو تـوانیی هێزەکـانی کۆبکاتـەوەو لـەماوەی سـەرقاڵبوونی سـوڵتان لەشـام و میسـر هەنـدێ پـەلاماردانی سـووك ئەنجام بدات [4].

سیاسـەتی خنکانـدنی ئـابووریی کـە سـوڵتان سـەلیم دژ بەسـەفەوییەکان پـەیڕەوی دەکـرد، شـای پاڵـدا بـۆ گـەڕان بـەدوای هاوپەیمانێکی بەهێز، ئەوەش لـەو پرتوگالییانـەدا فەراهـەم بـوو کـە لـەدەریادا چـالاك بـوون، بۆیـە لەگەڵیانـدا ڕێککـەوت و ئـەوەش

---

[1] - أبو الحسن علوي بن حسن عطرجي، الصفويون والدولة العثمانية، پێشەکی و پێداچوونەوەی: محمد بن حسن بن عقيل موسى، دار الأندلس الخضراء،١٤١٤/١/٦هـ، بەگواستنەوەی لە كي لسترنج، بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة: بشير فرنسيس وكوركيس عواد، بيروت: مؤسسة الرسالة، ط٢، ص١١٤و ١٢٥.

[2] – أحمد الخولي، الدولة الصفوية– تاريخها السياسي والاجتماعي– علاقتها بالعثمانيين، مكتبة الأنجلو المصرية، ١٩٨١م، ص٨١و ٨٢.

[3] – محمد فريد بك المحامي، سەرچاوەی پێشوو، لا٩٠.

[4] - عباس إسماعيل صباغ، سەرچاوەی پێشوو، لا١٣٤.

قەرەبووی هەندێ لەزیانی ئەو خاڵە ستراتیژییانەی کردەوە کە لەسەر دەستی عوسمانییەکان زیانی کردبوو[1]، پورتوگالەکانیش بەدوای هەلێکی لەو شێوەیەوە بوون تاوەکو لەفشاری عوسمانییەکان لەسەریان رزگاریان بێ[2].

رێککەوتنی نێوان شا ئیسماعیل و بوکرکی فەرمانڕەوای پورتوگال لەهیند لەسەر چوار خاڵ بوو کە ئەمانەی خوارەوەن:

١- هێزێکی دەریایی پورتوگالیی لەگەڵ هەڵمەتی ئێراندابێ بۆ سەر بەحرەین و قەتیف.

٢- پورتوگال لەگەڵ ئێراندا هاوکاربێ لەسەرکوتکردنی بزووتنەوە هەڵگەڕاوەکانی بلوشستان و مەکران.

٣- یەکگرتنی هەردوو دەوڵەت لەڕووبەڕووبوونەوەی دەوڵەتی عوسمانی.

٤- چاولادانی حکومەتی ئێران بەرانبەر دوورگەی هورمزو رەزامەندە بەوەی فەرمانڕەواکەی سەر بەئیتاڵیابێ و لەکاروباری ناوخۆی ئەو دوورگەیە دەست وەرنەدات[3].

---

[1] - علي محمد الصلابي، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٠٦.

[2] - علي محمد الصلابي، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٠٦.

[3] - أحمد الخولي،سەرچاوەی پێشوو،هەروەها: نبيل عبد الحي رضوان. جهود العثمانيين لإنقاذ الأندلس واستردادە في مطلع العصر الحديث، ط١، مكة المكرمة، مكتبة الطالب الجامعي، ١٩٨٨م، ص٤٣٦و ٤٣٧.

ڤینیسیا(بوندوقیه) لەو دەوڵەتانە بوو کە لەڕووی بازرگانییەوە زیانمەند بوو بەهۆی زاڵبوونی عوسمانییەکان بەسەر دەوڵەتی بێزەنتەو لەنێوبردنی و داخستنی ڕێگەی سەرەکیی بازرگانیی نێوان ئاسیاو ئەورووپا، بۆیە شا ئیسماعیل شاندی نارده کۆشکی دەسەلاتی ڤینیسیا و داوای لێکرد لەڕووی دەریاوە هێرش بکاتەسەر عوسمانییەکان و خۆیشی لەڕووی وشکانییەوە، بەمەرجێ ڤینیسیا ئەو پێگانەی بەدەستبهێنێتەوە کە لەدەریای سپیی ناوەڕاست لەدەستی دابوو[1].

هەروەها لەو دەوڵەتانەی کە ئێران هەوڵی دا پەیوەندیی بازرگانیی لەگەڵدا دروست بکات بەئامانجی رزگاربوون لەدەوڵەتی عوسمانی، ئیسپانیاو مەجەر بوون، شا دوو نامەی بۆ هەردوو وڵات ناردو داوای گرێدانی پەیماننامەی دۆستایەتی و هاوکاریی کردو پێشنیاری بیرۆکەی یەککگرتنی کرد بەئامانجی لەنێوبردنی تورکەکان بەپێی دەربڕینی خۆی[2].

ئەگەرچی سوڵتان سەلیم لەساڵی٩٢٦ك/ ١٥٢٠ز نەخۆشیش بوو، ئەوە بیری کردەوە پێش سوپا بکەوێ و دەربچێ بۆ داگیرکردنی ئێران، بەلام لەهەشتی شەوالی هەمان ساڵ لەڕێگەدا مرد، ئەو مردنەی سوڵتان سەلیمی یەکەم هاندەری ئیسماعیل بوو بۆ

[1] - أحمد الخولي،سەرچاوەی پێشوو، ل٩٣.

[2] – سەرچاوەی پێشوو، ل٩٤.

تۆڵەکردنەوە لەعوسمانییەکان، بەڵام مەرگ رێگەی ئەویشی نەداو بەنەخۆشیی سیل مرد[١].

### تەهماسب(طهماسب)ی یەکەم(١٥٢٤– ١٥٧٦ز)

دوای مردنی شا ئیسماعیل، سەردەمی تەهماسبی کوڕی هات، سەردەمی ئەمیش درێژەی سەردەمی باوکی بوو لەململانێ لەگەڵ سەربازگەی سووننەدا، لەهەردوولایەنی عوسمانی و ئۆزبەکییەوە، فەرمانڕەوای ئەوکاتی عوسمانی سوڵتان سلێمانی قانونیی بوو، ئامادەسازیی کرد بۆ داگیرکردنی دەوڵەتی سەفەوییەت، کە سەفەوییەکان ئەو هەواڵەیان پێگەیشتەوە پەیوەندییان کردە پادشای مەجەر تاوەکو دژ بەدوژمنی هاوبەشیان هاوکارییان بکەن، بۆیە سوڵتان سەلیم بەکوشتنی دیلەکانی بەردەستی وەڵامیانی دایەوەو بڕیاریدا هەڵمەتێکی بەهێز رووبکاتە ئێران، بەڵام یەکەمجار هێزەکانی رووبکردە مەجەر، چونکە ئەو بەرەیە گرنگتر بوو، ئامانجی سەرەکیی بوو لەڕووبەڕووبوونەوەی مەسیحییەکاندا[٢]، ساڵی٩٣٤ک/ ١٥٢٨ز برسێتی و وشکەساڵی و گرانی باڵی بەسەر ئێراندا کێشا[٣]، هەروەها چەقبەستن لەپەیوەندییەکانی دەرەوەیدا.

---

[١] – سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣٧.

[٢] – نبيل عبد الحي رضوان،سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٨و ٤٣٩.

[٣] - أحمد كتابي، بجوهشي در زمينه جمعيت شناسي تاريخي إيران، فصيلة جمعيت، العدد ٢٥ و ٢٦، ص٣٤ بۆ ٥٨.

عوسمانییەکان عێراقیان گرتەوە، تەهماسب پێشتر بەغدای داگیرکردبوو، سەرەڕای ئەوەی فەرمانڕەواکەشی بەرگرییەکی ئازایانەو مردنانەی کردبوو.

سولتان سلێمان ئەستەنبولی بەجێهێشت و لەسنوور پەڕییەوە رووەو تەبرێزو ئیبراهیم پاشای کردە فەرماندەی ئەو سوپایەی کە بەبێ هیچ زەحمەتێك چووە تەبرێزەوە[1].

لەزستاندا سوپای عوسمانیی روویکردە بەغداو لە ٢٧ی جەمادی یەکەمی سالّی ٩٤١ك/ ٣دیسەمبەر(کانونی یەکەم)١٥٣٤ز سولتان سلێمان چووە بەغداوەو تاوەکو بەهار تیایدا مایەوە بەمەبەستی رێکخستنی بەڕێوەبردنی ویلایەتە نوێیەکان و بەهێزکردنی ئامرازەکانی بەرگری و رایگەیاند کە عێراق بۆ هەمیشە سەر بەدەولّەتی عوسمانییە، تەهماسب سەرقالّبوونی سولتان سلێمانی بەعێراقەوە قۆستەوەو گەڕایەوە تەبرێزو دەستی بەسەردا گرت، سولتان سلێمانیش تیمێك لەسوپاکەی نارد بۆ وەرگرتنەوەی تەبرێز، بەلاّم سوپای سەفەوی شکستی بەو تیمە سەربازییە هێنا[2].

سولتان سلێمان بەسوپایەکی گەورەی پڕ چەك و تفاق و سەربازەوە روویکردە ئێران، کە تەهماسب ئەو هەوالّەی بیستەوە بەسوپاکەیەوە هەلّهات بۆ چیاکان، سولتان سلێمانیش جارێکی تر

---

[1] – نبيل عبد الحي رضوان،سەرچاوەی پێشوو، لا٤٤١.

[2] – أحمد الخولي، سەرچاوەی پێشوو، لا١١٦.

چووە تەبرێزەوەو ناوچەکانی دەورووبەریشی داگیرکرد، پاشان هێزە عوسمانییەکان بەسرەشیان گرت و فەرمانڕەوایی عوسمانیی گەیشتە ئەحسا[1].

پادشا تەهماسب سیاسەتی وێرانکردنی پەیڕەو دەکرد، شارەکانی ولآتی خۆی وێران دەکرد تاوەکو پێشڕەوییکردنی عوسمانییەکان رابگرێ و بەسیاسەتی هاوسەنگکارو یەکلاکردنەوەی کێشە ئاینییەکانی، دوژمنانی عوسمانیی خستبووە دۆخی بێ لایەنییەوە، هەروەك هاندەری وێژەو هونەرەکانیش بوو.

بەتێکڕایی، پادشا تەهماسب چوار جەنگی لەگەڵ سولتان سلێمانی قانونیدا بەرپا کرد، دوای ئەوە لە٨رەجەبی ساڵی٩٦٢ك، سولتان سلێمانی قانونیی لەگەڵ شا تەهماسبدا ئاشتیی(ئەماسیەی ساڵی١٥٥٥ز) ئەنجامداو بەپێی ئەو رێککەوتنە، تەهماسب دانی نا بەسنووری دەوڵەتی عوسمانیی لەو ناوچانەی دەورووبەری ئەو خاکەیان دابوو کە پێشتر دەوڵەتی عوسمانیی تیایدا فەرمانڕەوایی دەکرد بەو شوێنانەش کە دواتر دەستی بەسەردا گرتبوو، هەروەك بەڵێنی دا دەست هەڵبگرێ لەبانگەوازکردن بۆ شیعەگەری و دەستدرێژیی نەکردنەسەر سنوورەکانی دەوڵەتی عوسمانی[2].

---

[1] – نبيل عبد الحي رضوان،سەرچاوەی پێشوو، ل١١٦.

[2] - سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤٥.

ئومێدی تەهماسب سەقامگیربوونی پەیوەندییەکانی نێوان خۆی و عوسمانییەکان بوو، چونکە دەرەقەتیان نەدەهات.

## ئیسماعیلی دووەم(١٥٧٦- ١٥٧٨ز)

لەدوای شا ئیسماعیل، کوڕەکەی جێگەی گرتەوە کە ناوی ئیسماعیلی دووەم بوو، وتراوە مەیلی سووننەییانەی هەبووە، چونکە لەسەردەستی مامۆستایەکی سووننە مەزهەب زانستی وەرگرتبوو، ئومێدی دەکرد مەزهەبی سووننە بگێڕێتەوە بۆ ئێران[١]، بەڵام خێرا لەسەردەستی پیاوانی قزلباش ژەهرخوارد کراو کوژرا، لەسەردەمی ئەودا هیچ شەڕێك لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا رووی نەدا.

## موحەممەد خودا بەندە(١٥٧٨- ١٥٨٧ز)

لەدوای ئیسماعیلی دووەم، شا موحەممەد خودا بەندەی برای بووە شای سەفەوییەکان، لەسەردەمی ئەودا شەڕ گەلێکی سەخت لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا روویاندا، ئەوەش کاتێك بوو کە سوڵتانی عوسمانیی مورادی سێیەم بینیی دۆخی ئێران ناجێگیرو شێواوە، بەهەلی زانی داگیری بکات و دەوڵەتی سەفەوییەت لەنێو ببات ئەگەرچی رێککەوتنی ئاشتیشیان لەنێواندا هەبوو، فەرمانی دا

---

[١] - سەرچاوەی پێشوو، لا١٤٩.

بەسەرکردایەتیی مستەفا پاشا هێرش بکرێتەسەر ئێران، سوپا رووەو خاکی ئێران جوولایەوەو سەرکەوتنی بۆ بوو تاوەکو قەلای تەفلیسی داگیرکرد[1].

## عەباسی یەکەم(١٥٨٧- ١٦٢٩ز)

دوای مردنی شا موحەممەد، کوڕەکەی جێگەی گرتەوە بەناوی عەباسی گەورەوە کە بەیەکێك لەسەرکردە بەهێزەکان دادەنراو ئێران لەسەردەمی ئەودا پەرەیسەندو پێشکەوت.

شا عەباس دەرکی کرد کە بەبێ پێکهێنانی سوپایەکی بەهێزی ئامادە، توانای رووبەڕووبوونەوەی عوسمانییەکانی نابێ، بۆیە"اللە ویردی خان"ی فەرماندەی سوپاکەی راسپارد بەپشت بەستن بەو ئەورووپییانەی لەشەڕدابوون لەگەڵ عوسمانییەکاندا سوپایەکی نوێ دابمەزرێنێ و ئامادە بکات، هەروەك بریتانییەکانیش بەتایبەت(برایانی شارلی) یارمەتییان دا لەبوونیاتنانی سوپایەکی نوێدا[2]، بۆیە بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا زۆرێك سەرکەوتنی

---

[1] - سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٤- ١٦٥.

[2] - بڕوانە: عبد الحسين نوايي، وعباسقلي غفاري، تاريخ تحولات سياسي، اجتماعي، اقتصادي وفرهنكي إيران در دوران صفوية(تاريخ التحولات السياسية والاجتماعية والاقتصادية والثقافية في إيران عهد الصفوية)، ط١، طهران: سمت. آبان١٣٨١ش(نوفمبر/ تشرين الثاني٢٠٠٢م)، الفصل السابع.

دەستخست کە لاوازیی تیایدا دەستیپێکردبوو، پەلاماری هێزە عوسمانییەکانی دا لەتەبرێزو تیایدا دەریانی کردو دەستی کردە کشان بۆ شوێنەکانی تر.

هەردوولا زۆرێك رێککەوتنیان ئیمزا کرد کە دەستدرێژیی نەکەنە سەر سنووری یەکتر، بەلام لایەنی سەفەویی هەمیشە بێ پەیمانیی ئەکرد، چونکە لەو کاتەدا هەستی بەلاوازیی دەوڵەتی عوسمانیی ئەکرد[1].

ئەو جەنگانەی کە شا عەباس دژ بەدەوڵەتی عوسمانیی ئەنجامی دەدا یارمەتیدەری لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانی و لەتوانا کەوتنی بوون لەڕووبەڕووبوونەوەی ئەورووپادا.

شا عەباس پەیوەندیی گەلێکی لەگەڵ لایەنی ئەورووپیدا هەبوو، لەڕێگەی بەنادیقەوە پێشنیاری بەئیسپانەکان دابوو تاوەکو لەگەڵیاندا خاکەکانی دەوڵەتی عوسمانیی دابەش بکات، لایەنی ئیسپان بەشی ئەورووپای ببات و سەفەوییەت بەشە ئاسیاییەکەی دەوڵەتی عوسمانیی ببات، بەلام ئەم پێشنیارەش وەك ئەو پێشنیارانەی تر بوو کە سەفیرە ئێرانییەکان بۆ ئەوانیان دەبرد[2].

---

[1] - أحمد الخولي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٦- ١٨٨.

[2] - محمد عبد اللطيف هريدي، الحروب العثمانية الفارسية وأثرها في انحسار المد الإسلامي عن أوروبا، ط١، القاهرة: دار الصحوة للنشر والتوزيع، ص٧٢.

دوای قۆناغێك كە پڕ بوو لەپەشێوی و نائارامی، دۆخی دەوڵەت لەسەردەمی عەباسی یەكەمدا سەقامگیر بوویەوە، كە لەساڵی١٦٠١ز بەحرەینی لەخۆگرت(تەواوی كەناری خۆرهەلاتی دوورگەی عەرەب)و لەساڵی١٦٠٢ز ئازەربێجانی داگیركرد، پاشان شیرازو ئەرمینیاو هەندێ بەشی ئەفغانستان لەساڵی١٦٠٨ز، پاشان عێراق و جارێكی تریش كوردستانیشی چووەپاڵ لەساڵی٢٣/ ١٦٢٤ز.

لەئاستی ناوخۆدا چاكسازیی گەلێكی سەرتاپای لەسوپادا ئەنجامداو پشتی بەستە هەندێ كۆیلەی مەسیحیی لەسەركردایەتیكردنی ئەو سوپایەدا، شاری ئەصفەهانی ئاوەدان كردەوەو لەئاستی جیهانیی ئەوكاتدا كردیە یەكێك لەشارە گرنگەكان، بەزاڵبوونیشی بەسەر كەنداودا توانی تێكەڵی بازرگانیی ببێ و بەو هۆیەوە ئابووریی وڵات بوژایەوە، لەسەردەمی ئەودا زۆرێك بۆنەی تایبەت بەكۆشكەكان بڕیاردرا كە ئەركی دەوروبەرو خزمەتكارانی كۆشك بوون بەرانبەر بەشا.

شا عەباس بەغدای گرت و ساڵی١٠٣٢ك/ ١٦٢٢ز زۆربەی ناوچەكانی عێراقی داگیركرد، لەشەوالی ساڵی١٠٣٣ك/ ١٦٢٣ز بەپێی

ڕێکەوتنی تەك عوسمانییەکان(پەیماننامەی ئەستەنبول١٥٩٠ك) ئەو زەوییانە کەوتەدەست ئێران[1].

## صەفیی یەکەم(١٦٢٩- ١٦٤٢ز)

شا عەباس چوار کوڕی هەبوو، لەترسی سەڵتەنەتی خۆی چاویانی هەڵکۆڵی و برسێتی و ترس و سەرکزیی پێیان چەشت[2]، لەدوای مردنی خۆی تەنیا سام میرزای نەوە هەرزەکارەکەی بۆ مابوویەوە، بۆیە بەمردنی شا عەباس لاوازی و هەرەس رووی کردە دەوڵەتی سەفەوییەت.

لەساڵی١٠٣٨ك/ ١٦٢٨ز سام میرزا لەتەمەنی حەڤدە ساڵیدا دەسەلاتی گرتەدەست و ناوی خۆی ناونا صەفی، ناوی باوکی بوو کە عەباسی باپیری کوشتی[3].

لەسەردەمی صەفیدا هەندێ پێکدادان روویدا لەنێوان سەفەوییەکان و عوسمانییەکان[1]، عوسمانییەکان دووجار هەوڵیاندا

---

[1] - بڕوانە: عبد الحسين نوايي، وعباسقلي غفاري، تاريخ تحولات سياسي، اجتماعي، اقتصادي وفرهنكي إيران در دوران صفوية(تاريخ التحولات السياسية والاجتماعية والاقتصادية والثقافية في إيران عهد الصفوية)، ط١، طهران: سمت. آبان١٣٨١ش(نوفمبر/ تشرين الثاني٢٠٠٢م)، الفصل السابع.

[2] - أحمد الخولي،(ن، م)، ص٢٠٨و عباس إقبال، تاريخ إيران بعد الإسلام: من بداية الدولة الطاهرية حتى نهاية الدولة القاجارية، گواستنەوەی لەفارسییەوەو پیشەکی و نووسین لەسەرکردنی:د. محمد علاء الدين منصور، القاهرة: دار الثقافة للنشر والتوزيع، ١٤١٠هـ، ص٦٨٨.

[3] – أحمد الخولي،(ن،م)، ص٢١٠.

بەغدا بگرنەوە، لەیەکەمین هەوڵدا شکستیانهێناو لەدووەمدا سەرکەوتوو بوون، کە پێنج ڕۆژ گەمارۆیان دا بەسەرکردایەتیی موحەممەد پاشا لەسەردەمی سوڵتان موراد لەساڵی١٠٤٨ك/ ١٦٣٨ز[٢].

وەها دەردەکەوێ سوڵتان صەفیی لەعەباسی گەورەی باپیرییەوە بۆی مابێتەوە، کە لەترسی دەسەڵات کەسوکاری لەنێوببات، چونکە مێژووی(روضة الصفا) دەگوازێتەوە کە لەساڵی١٠٤٢ك/ ١٦٣٢ز فەرمانی داوە چاوی زۆرێك لەکەسوکارو کوڕانی مامەکانی هەڵبکوڵرێ نەوەك تەماح بکەنە دەسەڵات، لەهەمان ساڵدا هەندێ لەو کوێرە داماوانەی کوشت کە لەبرسا ئەپاڕانەوەو دەکڕوزانەوە[٣]، تەنانەت بەلێدانی پێنج خنجێر ژنەکەی خۆیشی کوشتووە، بنەماڵەی دڵسۆزی ئێرانی لەلایەن ئیمام قلی خان و کنج عەلی خان لەئێران لەڕیشە هەڵکێشا[٤].

---

[١] - بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەو شەڕانەی سەفەوییەت ئەنجامی داو بەتایبەت خودی صەفیی شا بڕوانە: حانبابا بياني، تاريخ نظامي إيران: جنكهاي دوره صفوية،(تاريخ إيران العسكري: حروب الصفوية)، ط١(التحرير الثاني)، طهران: مرشد، ١٣٨٠ش،(٢٠٠٢م).

[٢] - أحمد الخولي، هەمان سەرچاوە، ٢١٠.

[٣] - أبو الفضل عابديني، متن منقح معاهده(زهاب) بين إيران و عثماني(١٠٤٩هـ، ١٦٣٩م)(النص المنقح لمعاهدة زهاب بين إيران والعثمانية)،كزارش كفت وكو، العدد١٦، فروردين واردیبهشت١٣٨٤ش،(نيسان و أيار٢٠٠٥م)، ص١٢٢و١٢٣.

[٤] - أبو الفضل عابديني، العلاقات السياسية بين الصفويين والعثمانيين، منذ معاهدة زهاب حتى سقوط اصفهان فصيلة نصوص معاصرة، العدد٩، شتاء٢٠٠٧م، ص٢٨٠.

## پەیماننامەی قەسری شیرین یان پەیماننامەی زەهاب

یەکێکە لەگرنگترین پەیماننامەکانی نێوان سەفەوییەت و عوسمانیی کە لەو ماوەیەدا گرێ دراوەو مێژووش دەقی رەسەنی ئەو پەیماننامەیەی بۆمان نەپاراستووە ئەگەرچی گرنگیش بووە، بەلاّم چەند نووسخەیەکی لەبارەوە هەیەو لەچەند شتێکی هەندەکیدا لەیەکتر جیاوازن.

ئەم پەیماننامەیە لەساڵی١٠٤٩ك/ ١٧مایو(ئایار)ی١٦٣٩ز لەنێوان شا صەفی و سولّتان مورادی چوارەمدا گرێدرا[1] و بووە بناغەی پەیوەندییە ئێرانی و عوسمانییەکانی سەدەکانی کۆتایی و کۆتایی بەسەدە گەلێکی پڕ لەجەنگ هێناو سنووری دیاریکردو تاوەکو ئەمڕۆ وەك خۆی ماوەتەوە جگە هەندێ گۆڕانکاریی کەم، بەپێی ئەو پەیماننامەیە قەوقاز کەوتە نێو سنووری ئێران و دواتر رووسیا زەوتی کرد، هەرچی عێراق و زۆربەی رۆژهەلاّتی ناوەڕاستە، ئەوە کەوتە ژێر دەسەلاّتی عوسمانییەکان[2].

پەیماننامەی قەسری شیرین بەدواداهاتنی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیریی خۆی هەبوو، چونکە بەپێی ئەو پەیماننامەیە دەوڵەتی

---

[1] - أبو الفضل عابديني،متن منقح معاهده(زهاب)بين إيران وعثماني(١٠٤٩هـ، ١٦٣٩م)، سەرچاوەی پێشوو، لا١٢٤و ١٢٥.

[2] - ل. دوري. روابط إيران با امبراتوري عثماني در سده هاي هيجدهم ونوزدهم، ترجمة: حسن زندية،(ترجمة الفصل الثامن من كتاب تاريخ الإمبراطورية العثمانية وتركيا الحديثة للمؤلف).

عوسمـــانیی فـــەرمانڕەوایی بەشـــێکی ئازەربێجـــانی وەرگـــرت و بـــەڕێوەبردنی عێـراقیش بەشـوێنە پیرۆزەکـانی شیعەشـەوە کـە ئێرانییەکان دەهاتنە سەردانیکردنی ئەو شوێنانە، سوپای ئێـرانیش بەپلەو لەسەر خۆیی بەرەو سستی و لاوازیی دەچوو بـەهۆی دۆخـی ئارامیی و خۆشگوزەرانییەوە[1].

لـەدوای ئـەو پەیماننامەیـە، لـەنێوان هـەردوو ولآتـدا سـەفیرەکان ئاڵوگۆڕ کران، لەوکاتەدا سەفیری هەمیشـەیی بـاو نـەبوو، بـەڵکو بـۆ جێبەجێکردنی ئەرکێکی گرنگ یـان نـاردنی نامەیـەك دەهـاتن، دوای پەیماننامەکـە کۆمـەڵێ شـاندی ئێرانـی هـاتن، کـە ئەمانـە بـوون: موحەممەد قلی خان،ساروخان، مورتـەزا قلـی خـان، ئیـبراهیم خـان ئیکرمـی و موحەممـەد خـان و پـیر عـەلی و کـەلب عـەلی خـان و عەبولمەعصـوم بـوون، لەبەرانبەریشـدا عوسمانییـەکانیش شـاندیان نـارد کـە ئەمانـە بـوون: بوسـتانی، ئیسـماعیل ئاغـا، عەبدولنـەبی چاوش، موحەممەد بەگ، موحەممەد پاشا، ئەلنوحەیفی، ئەحمـەدی دوری ئەفەندی[2].

---

[1] - أبو الفضل عابديني،متن منقح معاهده(زهاب)بين إيران وعثماني(١٠٤٩هـ، ١٦٣٩م)، سەرچاوەی پێشوو، لا١٢٤و ١٢٥.

[2] - أبو الفضل عابديني، العلاقات السياسية بين الصفويين والعثمانيين، منذ معاهدة زهاب حتى سقوط اصفهان،سەرچاوەی پێشوو، لا٢٨٨و ٢٨٩.

## عەباسی دووەم(١٦٤٢- ١٦٦٦ز)

دوای مردنی شا صەفی، عەباسی دووەم کە کوڕە نۆ ساڵەی شا صەفیی بوو لە پانزەی سەفەری ساڵی١٠٥٢ك-١٤مایو(ئایار)ی١٦٤٢ز پادشایەتیی وەرگرت، میرزا تەقیی راسپێردراوی پادشا بوو، یەکێك بوو لەمیرە نزیکەکانی باوکی[1]، ئەم (شا)یە ئاشتیخواز بوو، باس نەکراوە کە لەسەرەمی ئەودا هیچ پێکدادانێك لەگەڵ دەوڵەتانی دەورووبەری ئێران روویدابێ.

شا عەباسی دووەم پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا هەبوو، دیاری و نامەی ئاڵوگۆڕکراویان لەنێواندا هەبوو، ئەمەکداربوونی خۆیانیان بەبەڵێن و پەیماننامەکانەوە دووپات کردووەتەوە، عەباسی دووەم نامەی بۆ ئیبراهیم خانی سوڵتانی عوسمانیی نووسیووەو بانگیکردووە بۆ تۆکمەکردنی دۆستایەتییان و لەنامەکەدا هاتووە:"......لای ئێوە شاراوە نییە کە دانایی ئەوەی بڕیارداوە بێ گومان دونیا کۆتایی دێت، بۆیە هەموو متمانەیەکم ئەوەیە ئەو پادشایەی کە سێبەری خوایە بەبەردەوامیی چاوی لەسەر ئەم ئایەتەدا دەبێ کە خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ ﴾ الإسراء: ٣٤، واتا:وەفا بکەن

---

[1] - أحمد الخولي، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٦.

بەبەڵێن و پەیمانەکانتان بەڕاستی(خاوەن) بەڵێن و پەیمان پرسیار لێ کراوە.

بەردەوام لەم ڕێگە پیرۆزەوە لەسەر فەرزبوونی ئەمەکدارێتیی کار دەکات..."پادشای عوسمانییش بەدووپاتکردنەوەی ناوەڕۆکی نامەکەی وەلأمی دەداتەوە[1].

دەوڵەت لەسەردەمی عەباسی دووەم کۆتا شکۆی خۆی ژیا، ئاڵوگۆڕی بازرگانیی چڕکردەوە لەگەڵ دەوڵەتانی ئەورووپیدا لەڕێگەی کۆمپانیا گشتییەکانی بازرگانیی لەناوچەکەداو هەندێ چاکسازیی ناوخۆییشی کرد، ساڵی١٦٤٨ز هەندێ بەشی نوێی ئەفغانستانیش بەدەوڵەتەکەیەوە لکا[2].

## صەفیی دووەم(١٦٦٦- ١٦٩٤ز)

دوای مردنی عەباسی دووەم، لەساڵی١٠٧٧ك/ ١٦٦٦ز صەفیی کوڕە بیست ساڵأنەکەی جێگەی گرتەوەو پێیان دەوت شا سلێمان، بەخراپترین(فاسد) سوڵتانەکانی سەفەوییەت دادەنرێت، ژیانی لەعەرەقخواردنەوەو خراپەکاریدا بردەسەر[3]، باس ناکرێ کە لەسەردەمی ئەودا هیچ پێکدادانێك لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا

---

[1] - أبو الفضل عابديني، العلاقات السياسية بين الصفويين والعثمانيين، منذ معاهدة زهاب حتى سقوط اصفهان،سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٠.

[2] – هەمان سەرچاوە.

[3] - أحمد الخولي، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٠.

روویدابێ، ئازایەتیی ئەوەش بۆ شێخ عەلیی خانی زەنگەنە وەزیری ئـــەعزەمی پادشـــا دەگەڕێتـــەوە کـــە ڕۆڵێکـــی گرنگـــی گێـــڕا لەبەردەوامبوونی ئاشتیی نێوان هەردوو دەوڵەت و شکستی بەهەوڵی ئەورووپییـەکان هێنـا کـە دەیانوویسـت شـەڕو ئـاژاوە بخەنـە نێـوان هەردوو دەوڵەتەوە[1].

## حوسێنی یەکەم(١٦٩٤- ١٧٢٢ن)

دوای مردنـی شـا سـلێمان، حوسـێن مـیرزای کـوڕی دەسـەڵاتی گرتەدەست، لەسەردەمی ئەودا دوای ئەوەی ستەم و زۆرداریـی کـرد بەرانبـەریان لەگـەڵ ئەفغانەکانـدا شـەڕ هەڵگیرسـا، هـەروەك بـەهۆی لاوازیـی دەوڵەتـەوە رووسـەکان پـەلاماری ئێرانیـان داو کـەنارەکانی دەریـای خـەزەریان گـرت، بەدەسـتپێکردن بەدەربەنـد[2] تـاوەکو سـنووری ئیسـتراباد[3]، بۆیـە شـا ناچـاربوو رێککـەوتنێك لەگـەڵ رووسەکاندا ئیمزا بکات و بەشێوەیەکی فەرمیی دەستبەرداری زۆرێك ناوچەو شاری ئێرانی ببێ[4].

---

[1] - أبو الفضل عابديني، العلاقات السياسية بين الصفويين والعثمانيين، منذ معاهدة زهاب حتى سقوط اصفهان،سەرچاوەی پێشوو، لا٢٩٠، ٢٩١.

[2] - أبو الحسن عطرجي، سەرچاوەی پێشوو، بەگواستنەوەی لە(بلدان الخلافة الشرقية، ص٢١٤).

[3] – هەمان سەرچاوە، لا٤١٩.

[4] - أحمد الخولي، سەرچاوەی پێشوو، لا٢٢٢و ٢٢٦.

حوسێن میرزا پابەندی پەیوەندیی دۆستانە بوو لەگەڵ عوسمانییەکان بەپێی پەیماننامەی زەهاب و لەگەڵ سوڵتانی عوسمانیدا شاندی ئاڵوگۆڕیان لەنێواندا هەبوو[1].

دۆخی ولآت لەشێواندنێکی بەردەوامدا بوو، هەواڵەکان دزەیان دەکردە ولآتانی هاوسێ، ئەوان نامەی دۆستایەتی و خۆشەویستییان بۆ سوڵتان حوسێن دەنارد، بەلآم پیاوانی کۆشك بەپاڵنەری رق و ئیرەیییەوە وەلآمی نەگونجاوی بێ رێزیی پادشاو سەرۆکی ولآتانیان دەدایەوەو بەشێوەیەکی ناشیرینانە شاندەکانیان دەناردەوە ولآتەکانیان، ئەمە وەهای کرد لەرۆژی ناخۆشی و گەمارۆبوونی ئەسفەهان لەلایەن ئەفغانەوە ولآتانی هاوسێ پشتی ئێران نەگرن[2].

## تەهماسبی دووەم(١٧٢٢- ١٧٣٢ز)

دوای کوژرانی حوسێن میرزا، تەهماسبی دووەمی کوڕی شا حوسێن دەسەلآتی گرتەدەست کە هەژدە ساڵەی تەمەنی تێنەپەڕاندبوو، هێزو دەسەلآتی ئەفغان لەسەردەمی ئەودا بەردەوام بوو، گەمارۆی توونديان خستبووەسەر شارە ئێرانییەکان.

تەهماسب لەچنگی ئەفغانەکان بۆ تەبرێز هەڵهات و لەوێدا خۆی بەپادشا راگەیاندو داوای هاوکارییکرد لەعوسمانییەکان، دوژمنە

---

[1] - أبو الفضل عابديني، العلاقات السياسية بين الصفويين والعثمانيين، منذ معاهدة زهاب حتى سقوط اصفهان،سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٢.

[2] – هەمان سەرچاوە، ل٢٩٣و ٢٩٤.

مێژووییەکانی سەفەوییەکان، عوسمانییەکانیش هەلەکەیان قۆستەوە، بەتایبەت کە رووسەکان بۆ باکۆ پێشیان کەوتبوون و داگیریان کردبوو، سێ سوپایان ئامادە کردبوو بۆ داگیرکردنی قەوقازو تەبرێزو عێراقی عەجەم(ناوچە چیاییەکانی رۆژئاوای ئێران)، ئەو سوپایانە لەساڵی١٧٢٣ەوە تاوەکو١٧٢٥ز شەڕەکانیان دەستپێکردو لەهەموو شەڕەکاندا سەرکەوتووبوون، ئازەربێجان و کرمانشاو هەمەدانیان داگیرکردو سەفەوی و ئەفغانەکانیان تێکشکاند، پێشکەوتن و داوود خانیان بەنازناوی شیروان(شروان) شا وەك پادشا لەژێر فەرمانڕەوایی خۆیان دانا[1].

تەهماسب لەسالأنی١٧٢٤و ١٧٢٧و ١٧٣٢ز کۆمەڵێ پەیماننامەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا گرێدا، بەلأم لەو دۆخەی کە دەوڵەتی سەفەوییەت تیایدا دەژیا ئەو پەیماننامەیانە هیچ بەهایەکی نەبوو، تەهماسب هاوپەیمانییەتێکی لەگەڵ نادر شای سەرکردەی ئەفشارییەکان پێکهێنا بۆ رێگریکردنی ئەو پەلاماردانانەو رزگارکردنی دەسەلأت[2]، ئەو هاوپەیمانێتییە لێدانێکی سەختی پادشای سەفەوییەکان بوو، چونکە نادر شا لەشەڕەکاندا پاڵەوانێتیی بێ وێنەی ئەنواندو لای هۆزەکان خۆشەویست بوو، لەهەموو بەرەکانەوە شەڕێکی زۆری بەرپا کردو سەرکەوتنی شانس

---

[1] - بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە: ل. دوري. روابط إيران با امبراتوري عثماني در سده هاي هيجدهم ونوزدهم،سەرچاوەی پێشوو.

[2] - أحمد الخولي، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٢.

بوو، که لەکارەکەدا سەرکەوتوو بوو، هەمووان دانیان بەگەورەیی ئەودا نا لەرزگارکردنی ئێران لەهەموو بەرەکانی دەرەوەداو بەڕۆڵی خۆی داوای لەکارلادانی شا تەهماسبی دەکردو کوڕە شیرەخۆرەکەی کە عەباسی سێیەم بوو ئەوی بەفەرمانڕەوا لەشوێنی تەهماسبی باوکی داناو خۆیشی بووە راسپێردراوی، لەکۆتاییشدا تەهماسبی و کوڕەکەشی کوشت و خۆی دەستی بەسەر دەسەلاتدا گرت[1].

## کاریگەریی پێکدادانان و بەریککەوتنی نێوان سەفەوییەت و عوسمانی

پێکدادانی توندو تاڵی نێوان دوو گەورە دەوڵەتی ئیسلامیی سەردەمی خۆیان لەسایەتی دەرکەوتنی هێز گەلی نوێی ئەورووپا لەجیهانی ئەوکات، شوێنەوار گەلێکی مێژوویی گەورەی بەجێهێشت کە سەدە گەلێك بەردەوام بوو، ئێمەش بەم شێوەیەی خوارەوە شوێنەوارەکان باس دەکەین:

### شوێنەوارە سیاسییەکان

هەندێ لێکۆڵەر وەهای دەبینن کە جەنگە سەفەوییەکان لەگەورەترین هۆکارەکانی لاوازکەوتنی هێزی دەوڵەتی عوسمانیی بووە، ئەو جەنگانە ماوە درێژو توند بوونە کە بەس بووە بۆ ئەوەی

---

[1] – هەمان سەرچاوە، ل٢٤١.

عوسمانییەکان ماندوو لاواز بکات و توانای رووبەڕووبوونەوەی بەرەی ئەورووپایان لاواز بکات، ئەوەش واتای گەمارۆبوونی موسڵمانان دەگەیەنێ لەئەورووپادا[1]، چونکە زۆربەی جەنگەکان، سەرکردە عوسمانییەکانی ناچار دەکرد لەئەورووپاوە بگەڕێنەوە بۆ راگرتنی کشانی سەفەوییەکان، هەروەك ئەوە لەگەڵ سوڵتان سەلیمی عوسمانیدا روویدا کە لەئەورووپاوە گەڕایەوە بۆ وەستانەوە بەڕووی ئیسماعیلی سەفەویدا، ئەوەش بەڕێکیی کاتێك روویدا کە بۆ شەش مانگ گەمارۆی نەمسا درابوو[2].

لەبوسیکی سەفیری فردیناند لەکۆشکی سوڵتان موحەممەد فاتیحەوە گوازراوەتەوە ئەڵێ: دەرکەوتنی سەفەوییەکان، ئێمەی لەتیاچوونی دەستی عوسمانییەکان رزگارکرد[3].

بێگومان شەڕی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوییەکان کاریگەرییەکی راستەخۆی هەبوو لەسەر دەوڵەتی عوسمانی، جا لەبواری سەربازیدا بووبێ یان لەبواری ئابووریی دەوڵەتدا.

### شوێنەوارە ئابووری و بازرگانییەکان

داهاتی دەوڵەتی عوسمانیی زیانبار بوو لەو گومرکانەی کە لەڕێگە کۆنەکانی ئەنادۆڵەوە دەستی دەکەوت، چونکە زۆربەی ئەو

[1] – هەمان سەرچاوە، لا٧٠.

[2] – سەرچاوەی پێشوو، بەگواستنەوەی لە(الحروب العثمانية الفارسية، ص٦١).

[3] – هەمان سەرچاوە، لەپێشەکیدا.

ڕێگەیانەی کەوتنە بەر مەترسیی داخران و ئاڵوگۆڕی بازرگانیی نێوان هەرێمەکانی ئێران و عوسمانیی سنووردار هاتەوە، داهاتی دەوڵەتی عوسمانیی لەئاوریشمی ئێرانیی کەمیکرد، پورتوگالیش بەزاڵبوونی بەسەر دەریاکانی ڕۆژهەلات گەمارۆی خستەسەر هەموو ڕێگە کۆنەکانی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا لەڕێگەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە کە ئەوکات لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو[1].

لەڕووی ئابوورییەوە ئەورووپا سوودی لەو بارودۆخانە بینی، چونکە بەشێوەیەکی زۆر ئابووریی ئەورووپا کاریگەر بوو بەو گەمارۆ عوسمانییەی خرابووە سەر کاروانەکانی و ناوچەکانی هێزی بازرگانی، بۆیە لەوشکانیدا بازرگانیی ئەورووپا شکستی هێنابوو، ئەوەش هاندەری پورتوگالەکان بوو بۆ گرتنەبەری ڕێگەی دەریا بەمەبەستی دۆزینەوەی ڕێگە دەریاییەکان، بەلام ئەورووپییەکان لەوەدا سەختی و ناڕەحەتییان بینییەوە، لەڕێگەی دەریاشدا بازرگانییان تووشی گەمارۆبوون هاتەوە، لەبەرئەوەی عوسمانییەکان توانیان ڕێگەی کۆنی بازرگانیی ببڕن کە ئەورووپای بەڕۆژهەلاتەوە دەبەستەوە[2].

لەڕوویەکی ترەوە، خاکی عوسمانی ڕێڕەوی بازرگانیی پێکدەهێنا بۆ سەفەوییەکان، چونکە یەکەمین پەیوەندیەکی بەهێزی بازرگانیی

---

[1] - سەرچاوەی پێشوو، بەگواستنەوەی لە(جهود الدولة العثمانية لإنقاذ الأندلس، ص٤٣٨).

[2] - أحمد الخولي، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٨.

نێوان ئێران و ئەورووپا کە لەسەردەمی سەفەویدا دەستی پێکرد لەڕێگەی خاکی عوسمانییەوە بوو، بۆیە هەندێ بازرگانی ئێرانیی لەوکاتەوە لەدەوڵەتی عوسمانیدا نیشتەجێ بوون و کاریگەر بوون بەو چاکسازییە عوسمانیانەی کە بە "رێککارەکان" دەناسراو رۆڵێکیان گێڕا لەگواستنەوەی ئەو چاکسازییانە بۆ ئێران، ئەو چاکسازییانە تۆوی یەکەم و سەرەتای سەرهەڵدانی رۆشنگەریی بوو لەئێراندا کە بەبزووتنەوەی دەستووریی کۆتاییهات[1].

## شوێنەوارە رۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکان

ماوەی سەفەوییەت و عوسمانی و رووداوە مێژووییەکانی پێش ئەوەش، سەرەڕای ناکۆکی و ململانێی تاڵ، پەیوەندیی گەلێکی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیی گەورەی لەنێو ئەو گەلانەدا بەخۆوە بینی کە لەخاکی ئەو دوو ئیمپراتۆرییەتەدا نیشتەجێ ببوون، بۆ نمونە شەپۆلێك کۆچی زانایان هەبوو لەئێرانەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانیی کە لەپێش هاتنی سەفەوییەتەوە دەستیپێکردبوو، رەنگە بەهۆی ئەو پەشێویانەوە بووبێ کە ئێران سەدە گەلێك تیایدا ژیابوو، پاشان سەفەوییەت قووڕەکەی خەستترکردەوە بەهۆی سەرکوتکردنی سیاسییانەی مەزهەبی سوونە بەتایبەتی، هەروەك ئەو برسێتییەی

---

[1] - محمد تقي إمامي، نقش تنظيمات عثماني بر نهضت روشنفكري إيران، كزارش كفت وكو، العدد٢٧،تير١٣٨١ش، يوليو/تموز٢٠٠٢م، ص٨٥و ٨٦.

که لەسەردەمی سەفەوییەتدا روویدا بەتایبەت لەکۆتاییدا، یەکێك بوو لەهۆکارەکانی کۆچی بەکۆمەڵ و گشتیی بۆ شوێنەکانی ئەملاو ئەولا، لەوانە بۆ عێراق و شارەکانی نەجەف و کەربەلا بەتایبەت کە بەشێك بوون لەناوچەکانی عوسمانی.

لەکۆی ئەو زانایانەی کە لەئێرانەوە کۆچیان کرد بۆ دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی دەرکەوتنی سەفەوییەتدا، ئەم زانایانە بوون:

عەلائەدین ئەلئەسوەد(لەدایکبووی٨٠٠ك/ ١٣٩٧ز)بەڕێوەبەری خوێندنگایەکی ئایینیی بوو، داوود ئەلقەیسەری(لەدایکبووی٧٥١ك/ ١٣٥٠ز) زانای فەلسەفەو موتەصەویف بوو، عەلائەدین عەلیی چەلەبی ئەلفناری(سەدەی نۆ)زانای بیرکارینـاس و موتەصەویف، شەمسەدین نوحەیفی(لەدایکبووی٨٤١ك/ ١٤٣٧ز)نووسەر، عەلائەدین قوج حصاری(لەدایکبووی٨٤١ك/ ١٤٣٧ز)نووسەر، قازیی زادە رۆمی(سەدەی نۆ) زانای شێوەناس(هیئة)، عەلائەدین عەلیی ئەلتووسی(لەدایکبووی٨٦٠ك/ ١٤٥٥ز)نووسەر، فەتحوالللەی کوڕی ئەبو زەید ئەلشروانی(سەدەی یانزە)زانای شێوەناس، خەیرەدین خەلیلی کوڕی ئیبراهیم(سەدەی نۆ)زانای بیرکاریناس، عەبدولڕەحمان موئەیەد زادە(٨٦٠ك- ٩٢٢ك/ ١٤٥٥- ١٥١٦ز)نووسەر، قوتبەدین عەجەمی(لەدایکبووی٨٤١ك/ ١٤٣٧ز) پزیشك، شوکورالله ئەلشروانی(لەدایکبووی٩١٢ك- ١٥٠٦ز)پزیشك و موفەسیر، عەتائوالله عەجەمی(سەدەی نۆ) پزیشك و موفەسیرو زانای

بیرکارینـــاس، عەلائـــەدین عـــەلیی ئەلقوشچی(ســەدەی نۆ)زانـــای بیرکارینـــاس، مـــیرم چـــەلەبی(٩٤١ك/ ١٥٢٤ن)زانـــای بیرکارینـــاس، مەحمود موحەممەد دڵشـاد شێروانی(سـەدەی نۆ)پزیشـك، حـەکیمی عەجـەمیی لاری(ســەدەی نۆ)پزیشـــك، عەلائـەدین عـەلیی کـوڕی موحەممـــەدی شـــاهرودیی بەســـتامی(٨٧٥ك/ ١٤٧٠ن)نووســـەر، کەمالـــەدین تـــەبیب(٩١٣ك/ ١٥٠٧ن)، بەصـــیریی خوراســـانیی چـەلەبی(٩٤١ك/ ١٥٣٤ن)، عەلائــەدین عــەلیی ئەسـفەهانی(٩٣٣ك/ ١٥٢٦ن)قازی، موصەلیحەدین لاری(٩٧٩ك/ ١٥٧١ن) زانای لۆژیکناس و شێوەناس، نیزامەدین بیرجندی(٩٣٤ك/ ١٥٢٧ن) زانای بیرکاریناس و ئەستێرەناس، موزەفەرەدین عەلیی شیرازی(٩٢٢ك/ ١٥١٦ن) زانای ئەندازەناسی، عەلیی کـوڕی ئەحمـەدی شیرازی(سـەدەی دە) زانـای بیرکارینـاس، مەهـدیی شـیرازی(٩٥٧ك/ ١٥٥٠ن) زانـای لۆژیکنـاس و فەلســـەفە، موحیـــەدین موحەممـــەدی کـــوڕی عەبدولئـــەوەل ئەلقـــەزوینی(٩٦٦ك/ ١٥٥٨ن)قـــازیی، مـــەولا مەعصـــوم(١٠١٠ك/ ١٦٠١ن)قـــازی، حیســـامەدین حوسێن(ســـەدەی دە)وانەبێـــژ، مـــەولا شـــەریف(١٠٣١ك/ ١٦٢١)قـــازی، مـــەولا شـــەرەفەدین(١٠٠٩ك/ ١٦٠٠ن)مـــوفتی، مـــەولا عەبـــدولڕەحیم(١١٠٥ك/ ١٦٩٣ن)وانەبێـــژ، موحەممەدی کوڕی سلێمانی گەیلانی(١٠٢٦ك/ ١٦١٧ن)قازی، عەتری موحەممـــەدی ئەفەنـــدی(١٠٣٢ك/ ١٦٢٢ن) قـــازی و خۆشـــنووس، موحەممـــەد ئەفەنـــدی(١٠٩٢ك/ ١٦٨١ن)قـــازی، عـــەجمی عومـــەر

ئەفەندی(١١٣٨ك/ ١٧٢٥ز) پزیشك، موحەممەد ئەفەندی(١١١٦ك/ ١٧٠٤ز) زانای بیرکارێناس و کەسانی تریش زۆربوون[١].

بۆ زانیاریش، هەندێ لەو زانایانە بنەچە عوسمانیی بوون، بۆ ماوەیەك هاتبوونە ئێران پاشان گەڕانەوە، بەڵام زۆربەیان ئێرانیی بوون، کۆچی زانایان تەنیا بۆ دەوڵەتی عوسمانیی نەبوو، بەڵکو کۆمەڵێك لەزانایان روویانکردبووە عێراق و هیند و ئەو کۆچە بەکۆمەڵانە رۆڵی گرنگیان گێڕا لەنزیکخستنەوەی گەلان و لێکردنەوەی فتیلەی شەڕی بێ بەر، هەروەك رۆڵیشی هەبوو لەگواستنەوەی رۆشنبیری و خەمی فیکری و پێکهێنانی تۆوی نزیکخستنەوەی فیکری و مامەڵەی رۆشنبیریی نێوان گەلان.

[١] - توفيق حيدر زاده، مهاجرت علماي إيران به امبراتوري عثماني، مجلة فرهنك، ع٢٠و ٢١، زمستان١٣٧٥ش، بهار١٣٧٦ش،(شتاء وربيع١٩٩٧م)،ص٤٩و ٩٤.

# دەوڵەتی سەفەوییەت و شوێنکەوتەکانی ئایین و مەزهەبەکانی تر

"د. عەلی ئەلشەیخ* "

* - لێکۆڵەرو نووسەری عێراقی، مامۆستا لەزانکۆکانی ئێران.

# دەوڵەتی سەفەوییەت و شوێنکەوتەکانی ئایین و مەزهەبەکانی تر

"د. عەلی ئەلشەیخ* "

مێژوونووسان یەکدەنگن لەسەرئەوەی دروستبوونی دەوڵەتی سەفەوییەت(٩٠٦ك/ ١٥٠٠ن) خاڵی گۆڕانکارییەکی گەورە بووە لەمێژووی ئێران و تەواوی رۆژهەڵاتدا، نەوەکانی شێخ صەفیەدین و بەتایبەت شێخ جونەیدو شێخ حەیدەری کوڕی سەرکەوتووبوون لەبڵاوکردنەوەی مەزهەبی شیعەدا دوای ئەوەی لەبەر هۆکار گەلێکی سیاسیی بوونە شیعەو لەشێخی تەریقەتەوە بوونە داخوازیکاری دەوڵەتێکی خاوەن ئامانجی سیاسی و تواناداربوون لەهاوبەشیکردنی رووداوە سیاسییەکانی تەواوی ناوچەکانی ئێران و وڵاتانی دەورووبەریش، بەتایبەت عێراق، بەڵام ئایە هەڵوێستی سەفەوییەکان بەرانبەر شوێنکەوتەکانی ئایین و مەزهەبەکانی تر چۆن بووە؟

* - لێکۆڵەرو نووسەری عێراقی، مامۆستا لەزانکۆکانی ئێران.

**بۆیە ئەم جێباسە، بابەتی چۆنێتیی مامەڵەکردنی دەوڵەتی سەفەوییەت دەخاتەبەرباس بەرانبەر مەزهەبە ئیسلامییەکان و ئەو ئایینانەی لەئێراندا بوونیان هەبوو بەشێوەیەکی گشتی و باسێکی تایبەتیش بەهەڵوێستی دەوڵەتی سەفەوییەت بەرانبەر شۆڕشە ئایینییەکانی سەردەمی سەفەوییەت.**

بۆ یەکەمجار بوو راگەیندرا مەزهەبی شیعەی دوانزە ئیمامیی مەزهەبی فەرمیی ئێرانە لەسەردەمی سەفەوییەتدا، ئەوکات دەوڵەتی عوسمانیش لەهەرەتی شکۆو لوتکەی گەشەسەندنی خۆیدا بوو، بەتاکە نوێنەری خیلافەتی ئیسلامیی تەواوی موسڵمانان دادەنرا، جا بەهەستانی ئێران بەهەڵگەڕانەوە دژ بەدەسەڵاتی خیلافەتی عوسمانی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی شیعەی رکەبەری خیلافەی فەرمیی، بووە هۆلای هەلآیسانی جەنگ و ناکۆکیی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئیسلامی، دەوڵەتی سەفەوییەت لەسەردەمی شا عەباسی گەورەدا(٩٩٦- ١٠٣٨ك/ ١٥٨٨- ١٦٢٩ز) توانی زاڵبێ بەسەر شارە پیرۆزەکانی عێراق و سوپا شارپارێزەکەی عوسمانیی لەشاری کەربەلاو نەجەف دەربکات.

یەکێك لەپاڵنەرەکانی شیعەگەرێتی و بەشیعەبوونی سەفەوییەکان، جیاوازبوون بوو لەخیلافەتی عوسمانیی سووننە مەزهەب و یەکخستنی گەلانی ئێران لەژێر ئالآی ئیمپراتۆرییەتێکی

شیعە هاوشێوەی خیلافەتی عوسمانیی سووننە مەزهەب لەرۆژئاوای جیهانی ئیسلامی، بەڵام دروستبوونی دەوڵەتی سەفەوییەت لەسەر بنەمای مەزهەبی شیعە لەسەر دەستی شا ئیسماعیلی یەکەم، وەهایکرد هۆزە تورکەکانی ئەوکات کە لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوای جیهانی ئیسلامیی لەئاسیا درێژدەبوونەوە یەك نەگرن و بووە هۆی نەهێشتنی پەیوەندیی نێوان ئەو دوو جیهانە تورکییە.

لەڕاستیدا گۆڕانی سەفەوییەکان لەشافیعیی مەزهەبەوە بۆ شیعە مەزهەب تەنیا سوودی بەفارسەکان گەیاند کە مەزهەبی شیعەیان بەکاربردو بەکاری دەبەن بۆ پارێزگاریکردنی پێناسە نەتەوەییە فارسییەکەیان و ئامانجە سیاسییەکانیان لەناوچەکەدا، لێکۆڵەری بەناوبانگی ئێرانی، عەلیی شەریعەتیی ئەڵێ:"دەوڵەتی سەفەوییەت لەسەر تێکەڵەیەکی نەتەوەی فارس و مەزهەبی شیعە دروستبوو، کە ئەوکات رەوت و تەوژم گەلێك دروست بوو بانگەوازی دەکرد بۆ زیندووکردنەوەی کولتووری نیشتیمانیی و شانازیکردن بەپێناسی ئێرانیبوون و رێزدارکردنی عەجەم بەسەر عەرەب و بڵاوکردنەوەی بێزاری و بێ ئومێدیی بەرانبەر ئیسلام و جیاکردنەوەی ئێرانییەکان لەڕەوتی هەستانەوەی ئیسلامیی بەجۆش و شکۆدارکردنی کیسراکان"، بەهەرحاڵ ئەگەر ئەو شەڕە مەزهەبییە لەنێوبەرەی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە تورکییە روویندەدا کە گیانی سەدان هەزار

موسڵمانی تورکی چنییەوە، ئەوە جیهانی ئیسلامیی لەدۆخێکی زۆر باشتر لەئێستا دەبوو.

## سیاسەتی مەزهەبگەرای سەفەوییەکان

مەیلی شیعەگەرێتیی بنەماڵەی سەفەوییەت خواردەبێتەوە بۆ تایەفەیەکی شیعەی توندڕەو(غلاة) کە لەخاکەکانی ئاسیای بچووکدا نیشتەجێ ببوو و لەژێر دەسەڵاتی سەفەوییەتدا بوون، بۆیە فەرمانڕەوا سەفەوییەکان، بەتایبەت کەسانی سەرەتایان تەواو دووربوون لەشیعەی میانڕەوەوە[1] زۆر پابەند بوون بەمەزهەبی شیعەوەو پێداگربوون بۆ قایمکردنی پایەکانی و ئەوپەڕی هەوڵیاندا بۆ برەودان بەمەزهەبی دوانزە ئیمامەی شیعەو لەنێوبردنی هەر مەزهەبێکی تر لەپێگەی شیعە کەمبکاتەوە.

ئەو دەمارگیرییە توونددە پاڵیانی دا بۆ سەرکوتکردن و چەوساندنەوەی تەواوی مەزهەبەکانی تر کە بڵاوبوونەوەی ئەو مەزهەبانەیان بەمەترسیی بۆ سەر مەزهەبی دوانزە ئیمامەی شیعە دەزانی، لەکاتێکدا زۆربەی گەلانی ئێران سوونئە مەزهەب بوون، گردبوونەوەی شیعەکان چڕهاتبووەوە سەر چەند شارێکی سنووردار، وەکو: قوم و کاشان و رەی، جا کاتێك ئیسماعیلی سەفەویی خۆی بەشای ئێران تاجدار کرد، مەزهەبی شیعەی

[1] - بڕوانە: سفارتنامەهاي إيران، ص٢٢– ٢٤.

سەپاندەسەر تەواوی گەل و کردیە مەزهەبی فەرمیی دەوڵەت، ئەگەرچی هەندێ زانای موسڵمانی مەزهەبە جیاوازەکانیش نارازیی بوون[1].

راوێژکارەکانی پادشای گەنج لەدەمارگیریی توندی پادشا بۆ شیعەگەرێتی و سەپاندنی شیعە بەسەر گەلدا دەترسان، کاتێک وریاییان پێ دا کە رەنگە گەل شیعەگەرێتیی رەتبکەنەوە یان ملکەچی پادشایەکی شیعە مەزهەب نەبن، بەلام وەلامی دانەوە: "من بەو کارە ئەرکم خراوەتەسەرو خواو پێشەوا مەعسومەکان لەگەڵمدان و لەهیچ کەسێك ناترسم، ئەگەر لەو خەڵکە نارەزایی ببینم، بەهاوکاریی خوا شمشێریان بۆ هەڵدەکێشم و کەسیان بەزیندوو ناهێڵمەوە"[2].

پادشا سەفەوییەکان باش دەیانزانی کە گۆڕینی مەزهەبی فەرمیی و سەپاندنی مەزهەبێکی نوێ کارێکە بەئاسان جێبەجێ ناکرێ، بۆیە پەنایان بردەبەر بانگهێشتکردنی هەندێ زانای(جبل عامل) بۆ گەیاندنی مەزهەبی شیعەو فێرکردنی خەڵك بەبیروباوەڕو ئەحکامی شیعەگەری[3]، ئەوەش دوای ئەوەی زانا شیعەکانی عێراق لەبەر هۆکار گەلێکی ئایینیی رەتیان کردەوە بەدەم داوای

---

[1] - شاه إسماعيل أول، ٦٩٤– ٦٩٧.

[2] - زندكاني شاه عباس أول، ج٣، ص٨٩٠.

[3] - مهاجرت علماي شيعة از جبل عامل به إيران در عصر صفوي، ١٥٦– ١٦٠.

سەفەوییەکانەوە بچن، بەوباوەڕەی جائیز نییە لەسەردەمی دیار نەبوونی ئیمامدا هاوبەشیی دامەزراندنی دەوڵەت بکرێ[1].

لەڕواڵەتەکانی گرنگیدانی زۆریان بەشیعەگەری، ئەو شێوازە بانگدانە بوو کە شا ئیسماعیل دایهێنا کە زیاتر کردنی: أشهد أن علياً ولي الله و حي على خير العمل بوو بۆ سەر ئەو بانگدانەی لەوڵاتانی سووننە مەزهەبدا باو و نەریت بوو.

دوای سەرکەوتنی شا ئیسماعیلی یەکەم بەسەر هۆزە تورکمانەکان و چوونە تەبریزەوە، فەرمانی دا بەناوی دوانزە ئیمامەکەوە وتار بدرێ و لەسەر دراوی فەرمیی بنووسرێ"لا إله إلا الله، محمد رسول الله، علي ولي الله" دواتر ناوی سوڵتانی سەفەویی بنووسرێ، دروشمی تریشیان دەخستەسەر دراوە فەرمییەکان، لەوانە:

- اللهم صل على محمد المصطفى وعلي المرتضى.
- بەسەرساميیەوە بانگ بکە لەعەلی، ئەویش لەناخۆشییەکاندا بەفریات دەکەوێ.
- يا علي بن موسى الرضا.
- يا صاحب الزمان.
- هەروەها ناوی تەواوی ئیمامەکانیان دەخستەسەر دراوە فەرمییەکان[1].

---

[1] – بڕوانە: کنش دين و دولت در إيران عصر صفوي، ص٣١– ٤١.

هـــــەروەها لەڕواڵەتـــــەکانی گرنگیـــــدانیان بەشــــیعەگەریی، پێداگربوونیان بوو بەئاهەنگگێڕان لەهــەموو بۆنەیـەکی شـیعەدا، بـۆ نمونە: جەژنی لەدایکبوونی هەموو پێشەوایانی شیعەو پرسـە گێـڕان لـەیادی مـردن و شـەهیدبوونیان، شـا عـەباس لەهــەموو سـاڵێکدا لەنۆزدەی رەمەزانـەوە تـاوەکو بیسـت و حـەوتی رەمـەزان بەبۆنـەی شەهیدبوونی ئەمیری باوەڕداران عەلیی کوڕی ئەبو تاڵیبەوە پرسـەی دەگێڕا، هەروەها لەدە رۆژەی موحەڕەم و شەوی عاشـورادا پرسـەی دەگێڕا[2].

شا عەباس پێـداگربوو لەسـەر زۆر سـەردانیکردنی گـۆڕی شـێخ و ئیمامـە شـیعەکان و خزمـەتکردنیان، سـەردانی گـۆڕی ئیمـام رەزای دەکـرد لەمەشـهەدو جارێکیـان بـەپێ لەئەسـفەهانەوە بـۆ مەشـهەد چـووە سـەردانی ئـەو گـۆڕە کـە(١٢٣٣)کیلۆمـەتر نێوانیانـە وەك بـەجێهێنانی نـەزرێك کـە نـازانرێ نـەزری چـیی کردبـوو، لـەڕۆژی پێنجشــەممە، پـانزەی جـەمادی یەکــەمی ســاڵی١٠١٠ك بەرانبــەر بەهەشــــتی نۆڤەمبەر(تەشــــرینی دووەم)ی١٦٠١ز بەڕێکــــەوت و لەچواردەی جەمادی دووەمی هەمان ساڵ بەوێ گەیشت و سێ مانگ لەوێدا مایەوە خزمەتی دەکرد، جا هەندێ مێژوونووسی سـەفەوییەت لەســـەر ئـــەو گەشـــتە ئـــەڵێن:"زانایانی مێــژوو دەزانــن کــە هــیچ

---

[1] - تاريخ فرهنك وتمدن إيران در دوره صفوية، ص١٦٨- ١٧٠.

[2] - زندكى شا عباس أول، ج٣، ص٦٠.

فەرمانڕەوایەك نمونەی ئەم ڕێگەیەی نەگرتووەتەبەر کە شا عەباس گرتیەبەر، کە هیرقەل لەقوستەنتینییەوە بەڕێکەوت بۆ بەیتولمەقدیس ڕێگەکەیان گوڵ و ڕەیحانە ڕێژ کرد، کەچی شا عەباس بەسەر چەو و لم و بێ ئەوەی پەرستن بکرێ و ڕێگەی بۆ خۆش بکرێ و کەژاوەی بۆ ڕێکبخرێ ڕێگەی گرتەبەر و ڕۆیشتن بەپێ خاوسیی هەڵبژارد"[1].

دوای ئەوەی توانی لەساڵی١٠٣٢ك/ ١٦٢٢ز فەتحی بەغدا بکات و شارە پیرۆزەکانی لای شیعە کە کەربەلاو نەجەف و کوفە بوون داگیربکات، ئەبینین خێرا دەکات بۆ سەردانیکردنی ئەو شوێنانە، هەندێك باس دەکەن کە دە ڕۆژ لای گۆڕی عەلیی کوڕی ئەبو تالیب ماوەتەوە لەنەجەف و خزمەتی زیارەتکارەکانی کردووەو خاکی گۆڕەکەی گسك داوە[2] وەك ڕاگەیاندنی شوێنکەوتە بوونی و گەڕانەوەی بۆ بنەماڵەی عەلیی کوڕی ئەبو تالیب و پابەندبوونی بەمەزهەبی شیعەوە نازناوی(سەگی گۆڕی پیرۆزی عەلی) یان(سەگی شوێنی پیرۆزی ویلایەت)ی لەخۆی ناو ئەم نازناوەی خستەسەر مۆرەکەی تاوەکو لەنامە فەرمییەکاندا بەکاری بهێنێ[3].

ئەگەرچی سەفەوییەکان دەمارگیرییەکی سەختی مەزهەبییان هەبوو، بەلاّم هەندێ لەسوڵتانەکانیان نمونەی شا عەباسی گەورە

---

[1] - ملحقات تاريخ روضة الصفاء، ج٨، ص٣٢١.

[2] - زندكى شا عباس أول، ج٣، ص١٩.

[3] — دين و مذهب در عصر صفوي، ص٥٧.

پێـــداگربوون هێـــزو دەســـەلاتی پیـــاوانی ئـــایین کـــەم بکەنـــەوەو دەستوەرنەدەن لەکاروبارە سیاسییەکانی دەوڵەت، بەلاّم پادشایانی تریان بەتایبەت لەسەردەمی سوڵتان موحەممـەد خوابەنـدەدا بـواری لەبەردەمیاندا کردەوە لەگەورەو بچووکی کاروباری سیاسیی دەوڵەت دەستوەربدەن، ئەوەش پەرچـەکرداری سـەردەمی پـێش خـۆی بـوو لەسـەردەمی شـا ئیسـماعیلی دووەمـی کـوڕی تەهماسـبی کـوڕی ئیسماعیلی یەکەمیی سـەفەوی، چـونکە بـەهۆی رەتکردنـەوەی ئـەو شیعە توندڕەوییەی کـە دەوڵـەتی سـەفەوییەت پێـی تایبەتمەنـدبوو نیازی بوو بگەڕێتەوە سـەر مەزهـەبی سـووننە، بـەلاّم لـەو بیرۆکەیـە پاشگەزبوویەوە دوای ئەوەی راوێژکارەکانی قەناعەتیان پێ کرد کـە جارێکی تـر گەڕانـەوە بـۆ مەزهـەبی سـووننە واتـا چـوونی دەوڵـەتی سەفەوییەت بۆ نێـو هێـزو دەسـەلاّتی دەوڵـەتی عوسمـانیی سـووننە مەزهـــەب، لەکۆتاییشـــدا لەســـەر دەســـتی قزلباشـــە توونـــدڕەوەکان بەژەهر خواردن کوژرا، وتـراوە لەسـزای وازهێنـانی لەپاڵپشـتیکردنی شـــیعەی توونـــدڕەو و نیـــازی گەڕانـــەوەی بـــۆ مەزهـــەبی ســـووننە کوژراوە[١].

سیاســەتی توونــدی فــەرمانڕەوا ســەفەوییەکان تــەنیا کــورت نەهاتبوویەوە سەر سـووننە، بـەڵکو هـەموو کەمینـەکانی ئێرانیشـی

---

[١] - شاه إسماعیل دوم: شاه تباه شده، ص١٥٩- ١٦٠.

گرتەوە لەمەسیحی و جولەکەو مەجوسی و مەزهەبە سۆفییەکان[1]، ئەوەش کاری هەر فەرمانڕەواییەکە لەسەر ئایین دابمەزرێ و مەزهەبێکی دیاریکراو بەسەر گەلدا بسەپێنێ و ئایین ببەستێتەوە بەباری ئارامی و بەرژەوەندیی گشتییەوە، ئەوەیە کە لەعێراقی نوێدا لێی دەترسێین بەهۆی بوونی مەرجەعییەتێکی نوێوە کە دەسەلاّت پەیڕەوی دەکات.

سەفەوییەکان هێزو دەسەلاّتی پیاوانی ئایینی لەدەسەلاّت فراوان دەکردەوەو توونددڕەویی ئایینیی بەرانبەر کەمینەکان زۆرتر دەکردەوە، هەروەك لەسەردەمی سولّتان حوسێنی سەفەویدا ئەوە دەبینین، دەستی دایە داوای جیزیە کردن لەکەمینەکان، بەتایبەت لەجولەکەو مەجوسییەکان و باجی تریشی لێیان دەسەند و تووڕەیی کەمینەکانی ورووژاند، کاتێکیش مەحمودی ئەفغانی پەلاماری دا بەمەبەستی رووخاندنی دەولّەتی سەفەوییەت، لەلایەن کەمینەی مەجوسیی یەزدو ناوچەکانی ترەوە پێشوازی و پشتیوانییەکی گەورەی بۆ بوو[2].

سەرەڕای هەموو ئەوانە، ئەوە مامەلّەی سەفەوییەکان بەرانبەر ئایین و مەزهەبە جیاوازەکان وەك یەك نەبوو، ئەوەش بەهۆی جیاوازیی بەرژەوەندی و بارودۆخەکانەوە بوو، بەشێوەیەکی باشتر

---

[1] - بۆ زیاتر شارەزابوون بگەڕێرەوە بۆ: سیاست واقتصاد عصر صفوي، ص٢٦٨.

[2] – انقراض سلسلة صفوية، ص٦٢– ٦٩.

لەگەڵ مەسیحییەکاندا دەجولآنەوە، ئەوەش بەهۆی پێویستییانەوە بوو بەهاوکاریی دەوڵەتانی ئەورووپاو دوژمنایەتیی هاوبەشی نێوان سەفەوییەکان و دەوڵەتانی مەسیحییەوە بەرانبەر عوسمانییەکان، بۆیە دوژمنی دوژمنەکەت بەدۆست و هاوڕێ دەزانی، لەمەی دادێت مامەڵەی فەرمانڕەوا سەفەوییەکان دەخەینەڕوو بەرانبەر گرووپەکانی سۆفی و ئەهلی سووننەو مەسیحی و جولەکە، بەتایبەتیش گرنگیی ئەو مەزهەب و ئایینانە لەسەردەمی سەفەویدا، بەبێ روانینە ئایینەکانی تری نمونەی مەجوسییەت و سائیبەو هیندۆس و بوزیی و مەزهەبەکانی تری نمونەی ئیسماعیلییەکان کە هەندێکیان ئەوکات لەئێراندا بوونیان هەبوو.

## یەکەم: سەفەوییەکان و گرووپە سۆفییەکان

بنەماڵەی سەفەوییەکان لەسەر شانی شوێنکەوتەی مەزهەبە سۆفییەکان شیعەبن یان سووننە شکۆو دەسەلآتی خۆیان دامەزراند، بەلآم خێرا کۆمەڵە ناکۆکییەك لەنێوان فەرمانڕەوایانی سەفەوییەت و شوێنکەوتەکانی سەر بەو گرووپە سۆفییانە دەرکەوت، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی زۆربەی ئەو سۆفییانە لەنێوبرێن تەنانەت ئەگەر شیعەش ببوونایە[1]، بۆیە پادشا بێ سوودەو بەشوێنکەوتەی یەك ئایین و تەنانەت تاکەکانی بنەماڵەش بەزەیی نایەتەوە.

---

[1] - برِوانە: تاريخ سياسي واجتماعي إيران، ص٣٢٦.

لەتەماشاکردنی ئەوەی بەسەر گرووپە سۆفییەکاندا هات، بەزۆریی بەداواو پشتگیریی شەرعناسان روویدەدا کە تەصەوفیان بەرکەبەری مێژوویی خۆیان دادەنا، بۆیە دەبوو بسڕدرێنەوەو نەهێلرێن وەك دەستپێکێك بۆ زاڵبوونی شەرعناسان بەسەر کاروبارەکاندا، دۆخەکە بەو جۆرە بەردەوام بوو تاوەکو لەنیوەی دووەمی سەردەمی سەفەوییەتدا شەرعناسەکان جڵەوی تەواوی کاروبارەکانیان وەرگرت.

بەهۆی بۆچوونی شەرعناسانی کۆشکی سەفەوییەوە بەوەی سۆفییەکان لادەرو گومڕان،و بەتایبەت دوای ئەوەی زانیی کە سۆفییەکان هەندێ پیلانی لەدژ دەگێڕن، شا عەباس جولانەوەیەکی لەنێوبەری دژ بەسۆفییەکان گرتەبەر[1]، گرنگترین نمونەش بۆ ئەوە، ئەوە بوو کە بەرانبەر نقوتییەکان روویدا کە ئەو مەزهەبە دەدرێتەوە پاڵ کەسێکی دانیشتووی گەیلانی باکووری ئێران و ناوی(مەحمود نامی)بووە، مەحمود ساڵی٨٠٠ك/ ١٣٩٧ز هەستاوە بەبانگەوازکردن بۆ ئەو مەزهەبە، بناغەی بانگەوازەکەشی ئەوە بووە، هەموو شتێك لەخاڵێك(نقطة) خۆڵەوە دەستپێدەکات، بۆیە مەزهەبەکەی بە(النقطوية)بەناوبانگ بوو[2]، شوێنکەوتەکانی ئەم مەزهەبە لەلایەن شا تەهماسبی یەکەمەوە(٩٣٠- ٩٨٤ك/ ١٥٢٣- ١٥٧٦ز) رووبەڕووی

---

[1] بۆ زیاتر شارەزابوون بڕوانە: دین و سیاست در دوره صفوي، ص٢٢١، ٢٦٦.

[2] - بڕوانە: زندكاي شاه عباس أول، ص٤٠- ٦٠.

کوشتن و نەهامەتیی بوونەوە، بەڵام شێوانی کاروبارەکان لەساڵانی فەرمانڕەویی شا ئیسماعیلی دووەم و سوڵتان موحەممەد خودابەندە، یارمەتیدەری نوقتەوییەکان بوو تاوەکو بانگەوازی خۆیان بڵاوبکەنەوە[1].

بەڵام کە شا عەباس لەسەر تەختی دەسەڵات گیرسایەوەو ئاگاداری بڵاوبوونەوەی هەڵکشانی نوقتەوییەکان بوویەوە، لەدەرکەوتنی هێزی جەماوەرێتیی رکەبەرێکی سەفەوییەت ترسا، بۆیە خێرا چووە بارەگەکەیان لەقەزوین بەبیانووی سەردانیکردنی رابەری سۆفی، پاشان فەرمانی دا بەدەستگیرکردنی سەرۆک و گەورەکانیان و کوشتنی ئەوانەو ئەوانەی بەئاشکرا سەر بەئەوان بوون[2].

هەروەها شوێنکەوتەی هەندێ گرووپی سۆفیی سوننە مەزهەبی وەك قادرییەت"کە شوێنکەوتەی عەبدولقادری گەیلانین"ناچاربوون بەهۆی توندڕەویی مەزهەبییانە لەدژیان ئێران بەجێبهێڵن[3].

### دووەم: سەفەوییەکان و ئەهلی سوننە

سەفەوییەکان بەزۆری و بەئاشکرا نەفرەتی خەلیفەکانیان ئەکردو،هەر لەسەرەتای دەسەڵاتییانەوە هەموویان بەدوژمنی

---

[1] - دين و سياست در دوره صفوي، ص٩٩.

[2] - زندكاي شاه عباس أول، ص٢٧٢- ٢٧٣.

[3] - تاريخ فرهنك وتمدن إيران، ص١٥٢.

پێشـــەوا عـــەلیی کـــوڕی ئـــەبو تاڵیـــب دەزانـــی، شـــوێنکەوتە توونـــدڕەوەکانی ســـەفەوییەت بە(خۆبەریکارەکان)دەناسـران، واتـا خۆیان بەریی دەکرد لەدوژمنانی ئەهلی بەیت[1]، بـەبازاڕو کۆڵانەکانـدا دەگەڕان و نەفرەت و جنێویان بەسێ خەلیفە راشیدییەکە دەدا(ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان) و تەواوی دوژمنانی پێشەوا عەلی، هەنـدێجار کارەکەیان گەورەتر دەکردەوەو جنێویان بەتـەواوی ئـەهلی سـووننە دەدا و پێویسـت بـوو ئـەو کەسـەی گـوێی لەنەفرەتەکـە بووایـە بەدەنگێکی بـەرز بیووتبایە:"خوایـە نـەفرەتیان لەسـەر زیـاتر بکـەو کەمی نەکەی"[2]، ئەگەر کەسـی گوێگر ئـەوەی نەوتبایـە ئەگـەر بـوو لەلایەن ئەو کۆمەڵەیەوە بکوژرابایە[3].

کاتێـــك ســـوڵتان ئیســـماعیل لەســـاڵی٩١٤ك/ ١٥٠٨ز بەغـــدای داگیرکرد، فەرمانی دا گۆڕی ئەبو حەنیفـە هەڵبدرێتـەوە کـە مـەزاری سـوونەی عێـراق بـوو، لەشـوێنەکەیدا ئاودەسـتخانەیەکی تایبـەت بەشیعەی دروست کردو ٢٥ دیناری بەهەر شـیعەیەك دەدا بچووایەتە ئەو ئاوەدەستەوە[4].

لەدەرکەوتنی دەوڵەتی سەفەوییەت ،دەوڵـەتی عوسمـانیی خـۆی بەپارێزەری مەزهـەبی سوونە دەزانـی لـەجیهانی ئیسـلامیدا ، ئـەو

---

[1] - زندكاي شاه عباس أول، ج٣، ص٨٩٩.

[2] - وەرگێڕانی دەربڕینە فارسییەکەیە کە دەیانووت:"بیش بادو کم مباد".

[3] - تاريخ فرهنك وتمدن إيران، ص١٦٨- ١٧٠.

[4] - زندكاي شاه عباس أول، ج٣، ص٨٩٠.

دومنایەتییە مەزهەبییەی نێوان عوسمانی و سەفەوییەکان بووە هۆی ململانێی چەکدارییانەی بەردەوامیی نێوانیان، ئەو شەڕانەش ڕۆڵ و شوێنەواریان هەبوو لەزیاترکردن و قووڵکردنەوەی ناکۆکیی مەزهەبیی نێوانیان و زیاتر بوونی دەمارگیریی سوڵتانە سەفەوییەکان بۆ شیعەگەری و رقبوونەوەیان لەمەزهەبی سوننە[1]، لەلایەکی ترەوە مامەڵەی دوژمنکارانەی سەفەوییەکان لەگەڵ عوسمانییەکان و سیاسەتی ئایینیی نالێبووردەیی و دوژمنکارەیان کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر توندکردنەوەی ناکۆکییە ئایینییەکان، شا ئیسماعیل لەشوێنکەوتەکانی خۆی دەناردە ناوچە شیعەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیی لەئاسیای بچووک تاوەکو هەواڵیان پێ بدەن هاوکاریان دەبێ و بانگەوازیانی دەکرد بۆ هاتنە خاکی سەفەوی، زۆرجار ئەو بانگهێشتنامانە لەناوچەکەدا ئاژاوەو شەڕی لێ دەبوویەوە، ئەوەش بوو وەهای لەسوڵتانی عوسمانیی کرد کاری هاوشێوە بکات، پاڵپشتیی بۆ کوردەکانی ئازەربێجان دەنارد تاوەکو لەدژ حکومەتی سەفەویی راپەڕن[2].

دوژمنایەتییەکە بەو ئاستە گەیشت کە شا عەباس هەوڵیدا ئێرانییەکان قایل بکات گەشتی مەککە نەکەن بۆ بەجێهێنانی فەریزەی حەج و تەنیا سەردانی گۆڕی ئیمامی هەشتەمین بکەن

---

[1] - تاريخ روابط خارجي إيران، ص١٦- ١٧.

[2] - زندكاي شاه عباس أول، ج٣، ص٨٩٠، ٨٩٧.

عەلیی کوڕی موسا ڕەزا لەمەشهەد، چونکە ئەرکی نەتەوەیی وەها پێویست دەکات ئێرانییەکان بەتێپەڕبوون بەخاکی عوسمانیدا گەشت نەکەن و ڕسوماتی تێپەڕبوون بەو دەوڵەتە دوژمنە بدەن، جا بۆ ئەوەی ئارەزوویان پێ بدات بۆ ڕووکردنە مەشهەد، شا عەباس زۆرجار سەردانی مەشهەدی ئەکردو سەردانی گۆڕی هەشتەمین ئیمامی ئەکرد لەو شارەدا.

یەکێکی تر لەدیمەنەکانی مامەڵەکردنی سەفەوییەکان لەگەڵ ئەهلی سووننەدا، ئەوە بوو کە هەر شا عەباس کردی لەگەڵ دانیشتوانی قەڵای(ئەندخود)ی ئەودیوو ڕووبار(ما وراء النهر)، شا عەباس لەساڵی١٠١١ك/ ١٦٠٢ز ئەو قەڵایەی فەتحکردو ژیان و موڵکی خەڵکەکەی پاراست و دڵنیای کردنەوە ئەگەرچی سووننە مەزهەبن ئەوە هەرگیز بەخراپە مامەڵەیان ناکات، بەڵام لەساڵی١٠١٢ك/ ١٦٠٣ز کە لەگەمارۆدانی شاری بەلخ دەگەڕایەوە بەبێ هۆیەکی ڕوون فەرمانی بەسەربازەکانی دا پەلاماری قەڵای ئەندخود بدەن و تەواوی گەورەو پیاو ماقووڵ و ناودارەکانیان دیل کردو هەموو سەربازێکی سەفەویی دیلێکی خەڵکی ئەو قەڵایەی لەپێش خۆی بەڕێخست تاوەکو گەیشتنە ئەسفەهان.

بەهۆی ئەو جەنگە زۆرانەی کە سەفەوییەکان لەگەڵ عوسمانییەکاندا بەرپایان کردو زۆربەشیان لەگەڵ دیلە عوسمانییەکاندا دڵڕەق بوون کە زۆرینە سووننیی بوون، کەمترین

ســـزادانێکی دیلــه عوسمانییـــەکان ئەگـــەر نەکوژرابانایـــە چـــاو هـــەڵکۆڵینیان بـــوو، لـــەهیچ دیلێـــك لێخۆشـــبوون نـــەبوو تـــاوەکو دەستبەرداری مەزهەبی سووننە نەبووایەو نەبوایەتە شیعە، لەوانـەی ئەوەیان پێکرد شـەریف پاشـای فـەرمانڕەوای قـەڵای وانـی ناوچـەی ئازەربێجان بوو، لەدوای دیـل کـەوتنی رایگەیانـد کـە دەسـتبەرداری خزمەتکردنی سوڵتانی عوسمـانیی ئـەبێ و ئەبێتـە شـیعە مەزهـەب و لەئێراندا ئەمێنێتەوە، ئینجا شا لێیخۆش بوو، لەگەنجینەی تایبەتیی خۆی مانگانەیەکی بۆ بڕییەوە[1].

جەلالەدین موحەممەد ئەلیـەزدیی ئەسـتێرگرەوەی تایبـەتیی شـا عەباس لەکتێبەکەیدا(تاریخ عباسي) زۆرێك لەو جۆرە مامەڵانەی ئەك ئەهلی سووننە باسدەکات، کە لەمیانەی ئـەو بـاس گەلـەدا مامەڵـەی رەق و توونديان بەرانبەر سووننە مەزهەبەکان دەردەکەوێ[2].

نمونـــە گـــەلێکی تـــری ئـــەو جـــۆرە مامەڵانـــەیان لەگـــەڵ هـــۆزە کوردییەکاندا ئەبینین، ئەوانەی کە لەناوچـەکانی بـاکووری رۆژئـاوای ئازەربێجان و ناوچـەی کوردسـتاندا ئـەژیان و هاوسـنووری دەوڵـەتی عوسمانیی بوون و شـوێنکەوتەی مەزهـەبی سـوونیی بـوون و جـۆرە هاوســۆزییەك لـــەنێوان ئـــەوان و عوسمانییەکانـــدا هـــەبوو، پێشـــتر پاشـکۆیەتیی خۆیانیـــان بـــۆ دەوڵـــەتی ســـەفەویی راگەیانـدبوو وەك

---

[1] - زندكاي شاه عباس أول، ج٣، ص٣٨.

[2] - زندكاي شاه عباس أول، ج٣، ص٣٧، ٣٨.

ئـەوەی لـەڕۆژگاری فـەرمانڕەوایی شـا ئیسـماعیلی یەکـەم و شـا تەهماسبدا روویدا، بەڵام کاتێك لـەڕۆژگاری شـا ئیسـماعیلی دووەم و سـوڵتان موحەممـەد خودابەنـدەدا لەدەوڵـەتی سـەفەویدا ئـاژاوەو نائارامیی روویداو دەوڵەتی عوسمانییش تـوانی بـەش گـەلێکی زۆری ئازەربێجـان داگیربکـات، کوردەکـانیش هاوسـۆزیی خۆیانیـان بـۆ عوسمانییـە هاوسـوونییەکانی خۆیـان راگەیانـد، بـەڵام کاتێـك شـا عـەباس چـووە دەسـەڵات و تـوانی عوسمانییـەکان لەناوچـەکانی ئازەربێجان دەربکـات، پێداگربوو کـە هـەلی بـۆ هاتـەپێش تۆڵـە لـەو کوردە سوونییانە بکاتەوەو دەربەدەریان بکات.

لەسـاڵی١٠١٣ك/ ١٦٠٤ز ئاژاوەیـەکی کـورد دژ بەفـەرمانڕەوا سەفەوییەکان روویـداو بـووە هـۆی ئـەوەی کوردەکـان لەناوچـەکانی خۆیاندا هەندێ قەڵای بەهێز داگیر بکەن، بۆیە شا عەباس بڕیـاری دا سـەربازەکانی رووەو ناوجەرگـەی ناوچـەی راپـەڕیوو بجوڵێنـەوەو دەستبگرنەسەر قەڵا قایمەکانی و زەبری کوشندە لەو کوردانە بـدەن و کوشتن و دەربەدەرییەك تیایاندا بڵاوبوویەوە و هەموو پیاوێك بـەر شمشێر دەکەوت.

دوای ئەوەی سەلامەتییان پـێ درا، کوردەکـان هەوڵیانـدا سـۆزی شـا عـەباس رابکێشـن و لێیـان خۆشـبێ، سـەرکردەکەیان کـە(قوباد خان) بوو بەسەدو پەنجا سوارەوە رۆیشت بۆلای شا عەباس تـاوەکو

ملکەچیی خۆیانی بخەنە بەردەم و گوێڕایەڵی شا بن، بەلاّم هەرکە گەیشتنە کۆشکەکەی هەموویانی کوشت[1].

شا عەباس بەوەوە نەوەستا لەولاّتی خۆیاندا کوردەکان بکوژێ و ئازاریان بدات، بەڵکو هەنگاوێکی زۆر سەخت و دڵڕەقانەتری گرتەبەر، ئەویش کۆچپێکردنیان بوو بۆ ناوچە گەلێکی تر بەزەبری هێز، فەرمانی دا پانزە هەزار خێزانی کورد بەهەموو کەلوپەل و مەڕو مالاّتییانەوە لەکوردستانەوە بگوازرێنەوە بۆ رۆژهەلاّتی خۆراسان تاوەکو ببنە قەڵغانی مرۆیی لەنێوان ئێرانی و ئۆزبەکییەکاندا، بەوەش مەبەستی بوو ئەو کوردە سوننیانە یەکەمین کەسانێك بن بکەونە بەر لێدانەکانی ئۆزبەکی سوننە مەزهەب[2].

هەندێ فەرمانڕەوای رۆژگاری ئەمڕۆی ئێمەش، ئەو فەرمانڕەواو سوڵتانانەی سەردەمانی کۆنیان کردووەتە پێشەنگی خۆیان لەمامەڵەکردنیان لەگەڵ پێچەوانەکارو رکەبەرانی خۆیان، لەڕێگەی لەنێوبردن و راگواستنیان.

سەرەڕای ئەو دوژمنایەتییە ناشیرینەی بەرانبەر مەزهەبی سوونەو خەڵکانی سوونە، سوڵتانە سەفەوییەکان هەندێجار سۆزو بەزەییان بەرانبەر سوونەکان دەردەخست و رێزیان لەشاندەکانیان دەگرت، بەباشی پێشوازییان لەبازرگانە سوونەکان دەکرد کە

[1] - خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من أقدم العصور التاريخية حتى الآن، ص٢٠٧، ٢٠٨.

[2] - الشاه عباس الكبير، ١٠١، ١٠٤.

لـەولآتانی تـری ئیسـلامییەوە دەهـاتن، ئەوەشـیان دەکـرد بـەهۆی ویسـت و پێداگرییانـەوە بـوو بـۆ گەشـەپێدانی بازرگـانیی ئێـران، بەرانبەر ئەو قازانجە ئابوورییەی دەستیان دەخست، دەسـتبەرداری دومنایەتیی مەزهەبییان دەبوون[1].

### سێیەم: سەفەوییەکان و مەسیحییەکان

مامەڵەی سەفەوییەکان بەرانبەر ئەو هاولآتییـە ئێرانیانـەی ئـایین مەسیحیی بوون و خەڵکانی دەوڵەتانی مەسیحیی کە دەهاتنـە ئێـران بەمەبەسـتی گەشـت و تەنانـەت بەمەبەسـتی بەمەسـیحیکردنیش، پێچـەوانەی مامەڵـەکردنیان بـوو لەگـەڵ سـوونەکاندا،وەك پێشـتر باسمان کرد مامەڵەی سۆزو خۆشەویستیانەیان ئەکرا،ئەوەش بەهۆی راکێشـانی سـۆزی دەوڵـەتانی ئـەورووپای مەسـیحییەوە بـوو بـۆ دوژمنایەتیکردنی عوسمانییەکان و چالاککردنی بازرگانی و ئـابووریی ئێران[2].

بـۆ پاراسـتنیان لەپـەلاماری عوسمانییـەکان، شـا عـەباس ئەرمەنـەکانی گواسـتەوەو شـارو گـەڕەك گـەلێکی بۆیـان دروسـتکرد لەدەوروبـەری ئەسـفەهانی پایتـەخت، لەوانـە گـەڕەك و ناوچەی(جلفا)یە کە ناوی پایتەختەکەی ئازەربێجانیانەو کڵێسـایەکی

---

[1] - دائرة المعارف البستاني، طبعة مصر، ج١١، ص٤٨٦.

[2] - تاريخ صفوية، ج٢، ص٣٥٩- ٣٦٠.

گەورەشی بۆیان دروستکردو تاوەکو ئەمڕۆی ئێمە ئەو گەڕەکە لەئەسفەهاندا ماوە، هەروەك فەرمانی دا مانەوە و نیشتەجێ بوون لەو گەڕەکەدا تەنیا بۆ مەسیحییەکان بێ نەك کەسانی تر و لەسەر موسڵمانەکانی قەدەغە کرد لەوێدا خانوو بکەن تاوەکو هیچ کێشەیەکی مەزهەبیی روونەدات، بەوەش جلفای نوێ بووە سەنتەرێکی چالاکی مەسیحییەکان لەئێرانداو رۆڵێکی گرنگی گێڕا لەپارێزگاریکردنی ئایینی مەسیحییەت و کاری کرد بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت[1].

سوڵتانە سەفەوییەکان ئەوپەڕی هەوڵ و تێکۆشانیان دەدا بۆ هاندانی ئەورووپییەکان تاوەکو سەردانی ئێران بکەن و لەڕووی سیاسی و بازرگانیی و ئابوورییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، شا عەباس لەساڵی١٠٠٧ك/ ١٥٩٨ز فەرمانی دەرکرد رێگریی نەکرێن و دەبێ رێگە بدرێن لەخاکی دەوڵەتی سەفەویدا ئازادانە بسوورێنەوە، ئەمەش دەقی فەرمانە شاهانەکەیە:"لەمڕۆوە رێگە بەهاوڵاتیانی دەوڵەتانی مەسیحی و ئایین مەسیحییەکان دەدرێ لەهەر شوێنێکی نیشتیمانەکەماندا بوون و ئامادەییان هەبێ و لەهیچ حاڵێکدا رێگە بەهیچ کەسێك نادرێ سووکایەتییان پێ بکات، لەبەر ئەو پەیوەندیە دۆستانەیی و خۆشەویستییەی لەنێوانماندایە رێگە بەبازرگانە مەسیحییەکان دەدرێ بەتەواوی ئێراندا بسوورێنەوەو لەهەر

---

[1] - تاريخ صفوية، ج٢، ص٧٧٤- ٧٧٥.

شوێنێکی ئەم نیشتیمانەدا بیانەوێ کاری بازرگانیی خۆیان بکەن بەبێ ئەوەی لەلایەن هیچ کەسێکەوە هەر پلەو پایەیەکی هەبێ ئازار بدرێن، فەرمانڕەوابێ یان میر یا خان یان فەرمانبەر، هەروەها ئەو کەلوپەلە بازرگانیانەی کە لەگەڵ خۆیاندا دەیهێنن لەباج دەبەخشرێن، بۆ هیچ کەسێك نییە لەهەر پلەو پایەیەکدابێ تەنگیان پێ هەڵبچنێ یان ئەرکی قوورسیان بخاتەسەر و مافی پیاوانی ئایینییش نییە لەهەر ئەرك و پلەیەکدابن بوێرییان هەبێ زیانیان لێ بدەن یان لەبارەی بیروباوەڕە مەزهەبییەکانەوە قسەیان لەگەڵدا بکەن........".[1]

شا عەباس هەر بەوەندەوە نەوەستا، بەڵکو پێداگربوو لەهەموو بۆنەیەکدا لەگەڵ مەسیحییەکاندا هاوسۆزبێ و لەئاهەنگە ئایینییەکانیاندا بەشداریان بێ، بۆ نمونە لەساڵی١٠١٨ك/ ١٦٠٩ز هەندێ بەرازی ناردە کەرەج بۆ پێشکەشکردنی بەمەسیحییەکانی جلفا بەهۆی جەژنیانەوەو دواتر خۆیشی رۆیشت بۆلایان بۆ پیرۆزبایکردنی جەژنەکەیان و لەگەڵیاندا عەرەقی خواردەوەو فەرمانی دا بەپیاوانی کۆشکی سەفەویی لەو بۆنەیەدا لەگەڵ مەسیحییەکاندا عەرەقبخۆنەوە، ئەگەرچی ئەو جەژنە کەوتبووە

[1] - الشاه عباس الكبير، ص١٠٦.

پـانزەی مـانگی رەمەزانیشـەوەو پیـاوانی کۆشـکی سـەفەوییەت ناچاربوون بەزمانی بەڕۆژووەوە عەرەقبخۆنەوە ![1].

یەکێکی تر لەدیمەنـەکانی هاوسۆزبوونی لەگـەڵ مەسـیحییەکان، پێـداگربوونی بـوو لەسـەردانیکردنی کڵێسـاکان و چـاوپێکەوتنی قەشـەکان و گفتوگـۆکردن لـەکاروباری ئایینەکـەیان و بینینـی مەراسـیمە ئایینییـەکانیان و گوێبیسـت بـوونی ئامۆژگـاری و سـروودەکانیان، تائـەوەی شـارەزاییەکی زۆری لەسـەر ئـایینی مەسیحییەت پەیداکردو ئەوەش بووە هاندەری هەندێ قەشە تاوەکو لەشا عـەباس داوا بکـەن ببێتـە مەسـیحیی، ئـەویش بەنـەرمی و بـێ هەڵچوونەوە داوای لێبووردنی کردو وتی:"ئـەم قسـەیە بـا بهێڵینـەوە بۆ کاتێکی تر"، ئەم هاوسۆزبوونە بـەوە گەیشـت هەنـدێ کـەس شـا عەباس بـەباوەڕ لاواز بەئیسلام و مەزهـەبی شـیعە تۆمـەتبار بکـەن، بـەڵام ئێرانییـەکان بـەرگرییان لـێ دەکـردو ئـەیانووت ئـەم هاوسـۆزبوونەی شـا عـەباس لەگـەڵ مەسـیحییەکان پێویسـتییەکی سیاسـییە نـەك بیروبـاوەڕێکی مەزهـەبی، چـونکە پێـداگربوو خۆشەویسـتیی دەوڵـەتانی مەسـیحییەت رابکێشـێ تـاوەکو لەشـەڕی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا هاوکاریی بکەن[2].

---

[1] – زندكي شاه عباس أول، ج٣، ص٢٦٤.

[2] – زندكي شاه عباس أول، ج٣، ص٧٢.

لەوەدا دەکرێ بووترێت، سولّتانە سەفەوییەکان بەشێوەیەك گشتی و شا عەباسی گەورەش کە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەبەهێزکردنی کۆڵەکەکانی دەوڵەتی سەفەوییەت، هاوسۆزییان لەگەڵ مەسیحییەکاندا دەرخستووە، دەبینین زۆرجاریش ڕێگەیان بۆ کردوونەتەوە بەدروستکردنی کڵێساو موژدەدان بەئایینەکەیان لەنێو موسڵماناندا، بۆیە دەبینین لەو ماوەو دەمەدا زۆرێك زانای شیعە نامەیان دژی گاورەکان نووسیووەتەوەو ئایین و پووچەڵیی مەزهەب و ئایینی مەسیحییەکانیان سەلماندووە[1].

بەڵێ لەسەردەمی هەندێ سولّتانی سەفەوییدا ڕووداو و کات گەلێکی سەخت و تاڵ بەسەر مەسیحییەکاندا تێپەڕ بووەو زۆربەی بەهۆی بابەتی سیاسییەوە بووە، کە شۆڕشیان کردووە یان ئاژاوەیان نارەتەوە هەروەك لەسەردەمی خودی شا عەباسدا ڕوویداوە کاتێك کەوتە کوشتارکردن و سەرکوتکردنی مەسیحییەکانی کەرەج کە شارێکی نزیك بە تەهرانەو کڵێساکانیانی کردە مزگەوت[2]، هەروەك هەندێجار قەرزی بەبازرگانە مەسیحییەکان دەدا، هەر بازرگانێك نەیتوانیبایە قەرزەکەی بداتەوە دەبوو موسڵمان ببێ[3].

---

[1] - بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە: دین و سیاست در دوره صفوي، ص٣٠١، ٢٧٨.

[2] - زندكي شاه عباس أول، ج٣، ص٨٨.

[3] - تاريخ روابط إيران و اروپا در دوره صفوية، القسم الأول، ص٤٣.

## چوارەم: سەفەوییەکان و جولەکە

وێنــەی جولەکــە لەتــەواوی جیهانــدا، بەتایبــەت لەئــەورووپا لەسەردەمی سەفەوییدا وێنەیەکی رقلێبوونــەوەو قێزەونیــان هــەبوو، پادشــایان و قەشــەکانی ئــەورووپا جولەکــەکانیان بــیٚ بەشــکردبوو لەجوتیاری کردن و لەبواری بازرگانیشدا تەنگیان پێیــان هەڵچنیبوو، بواری بژێوی پەیداکردنیان بۆ نەمابوویەوە تەنیا بازرگانیکردن نــەبیٚ لەبابەت زیوو ئاڵتوون و قەرزدان بەسـوو، ئــەوەش بەقــەبارەی خــۆی رق و دوژمنایەتیی دەخستەوەو وێنەیەکی ناشیرین و رق لێبوونەوەی بەجولەکە دابوو، لەئەنجامدا جولەکــەکان لەهــەموان دابــڕاو بــوون و شــوێن و گــەڕەکی تایبــەت بــەخۆیانیان تایبــەت کــردو دەناســرا بە(غیتو)واتا گەڕەکی جولەکەکان، بەلەسەر خۆیی سیستــەمی غیتــو دەسەپێندرایەسەر جولەکەو رێگە نــەدەدرا لەجگــە گــەڕەکی خۆیــان لەشوێن و گەڕەکی تردا نیشتەجیٚ بن و شەوان بەگەڕەکەکانی تــردا بسوڕێنەوە[1].

حاڵی جولەکەی ئێران لەحاڵی جولەکەی ئــەورووپا باشـتر نــەبوو، فەرمانڕەواکان بەچـاوی سـووکەوە دەیانڕەوانییــە جولەکــەو زۆرجــار مامەڵەیــەکی توونــدو دڵڕەقانــەیان بەرانبــەریان دەکــرد، لەشــوێنە تایبەتەکانی خۆیاندا دەژیــان لەئەسفەهان بــووبیٚ یــان لەشــارەکانی

---

[1] - الصهيونية العالمية وإسرائيل، ص٥٨، ٥٩.

تری ئێراندا، جێی رق و تورەیی خەڵك بوون و هەندێجاریش ئازار دەدران، کاتێك شا عەباس ویستی جولەکەی ئەسفەهان بکاتە موسڵمان، فەرمانی دا هەر جولەکەیەك ببێتە موسڵمان چوار تمەنی پێ بدرێت، بۆیە بەشێکی گەورەی جولەکە پارەکەیان وەرگرت و بەڕواڵەت وەهایان دەرخست بوونەتە موسڵمان، بەلاّم کە دوای ماوەیەکی کورت شا عەباس زانیی لەترسی ئەودا بوونەتە موسڵمان و بەدڵەوە نییە، هێشتی لەئاییندارییی خۆیاندا ئازادبن[1].

جولەکەکان لەسەردەمی دەوڵەتی سەفەوییدا ژمارەیان کەم بوو، پێچەوانەی تەواوی کەمینەکانی تر، هەمیشە لەنێو خۆیاندا لەدووبەرەکیدا بوون، لەیەکێك لەیادەوەرییە ئەورووپییەکاندا هاتووە: "لەبیست و یەکی مانگی نۆڤەمبەر(تەشرینی دووەم)١٦١٩ز لەئەسفەهاندا لەنێو جولەکەکاندا ناکۆکییەك روویداو شکایەتیان بردەلای شا عەباس و یەکتریان تۆمەتبار کرد، لەنێو ئەو تۆمەتبارکردنەدا سێ یان چوار سەرکردەی ئایینییان بەسیحر و ئەنجامدانی تاوانی گەورە تۆمەتبارکرد، دوای دادگاییکردن فەرمانی کوشتنیان درا، ئەویش بەخستنیانە بەردەم ئەو سەگە دڕانەی کە تایبەت کرابوون بۆ کوشتنی تاوانباران و ئەوانەی حوکمی لەسێدارەدانیان هەبوو، سێ لەو کەسانە بوونە موسڵمان و دانەیەکیان کە ناوی(عبا) بوو موسڵمانبوونی رەتکردەوەو ئەو

---

[1] - زندکي شاه عباس أول، ج٣، ص٧٩.

لەسێدارە درا، سەگە درِەکان پەلاماریان داو لاشەیان پارچە پارچە کرد".

بۆیە مامەڵەو رێڕەوی سوڵتانە سەفەوییەکان لەگەڵ جولەکەدا هاوشێوەی مامەڵەی فەرمانڕەوایانی ئەورووپا بووە لەگەڵ جولەکەدا، ئەگەرچی کەمینە بوون، بەلأم لەلایەن سوڵتانەکان و تەواوی گەلی ئێرانەوە بێزراو بوونە کە ئیسلام لەو ولأتەدا ئاینی هەرە زۆرینەی ئەو وڵاتە بووە، هەڵوێستی توندی ئیسلام بەرانبەر جولەکە زۆر روونە[1]، بۆیە بۆ رازیکردنی تەواوی موسڵمانان دەبوو سوڵتانەکانیش زبر مامەڵەی جولەکەکانیان بکردبایە.

## شۆڕشە ئاینییەکانی سەردەمی سەفەوییەت

لەو ماوەیەدا بەهۆی ژینگەی جۆشوخرۆشی ئاینییەوە، هەندێ بانگەواز و شۆڕشی ئاینیی دەرکەوت، کە تەنیا لەدەرەوەی شیعە نەبوو، بەڵك هەندێ گرووپی شیعەش راپەڕین و فەرمانڕەوا

[1] - ئەم قسەیە راست نییە، بەڵکو ئیسلام لێبووردەییانە مامەڵەی شوێنکەوتەکانی ئەهلی کیتابی کردووەو لەقورئانیشدا ئەوە زۆر بەجوانیی دەردەکەوێ، ئەوەی لەسەرەتای ئیسلامدا لەنێوان موسڵمانان و جولەکە لەمەدینەدا روویداوە بەهۆی خیانەتی جولەکەکانەوە بووە، لەکاتی خۆشیدا ئاشتەواییان دەرخستووەو لەکاتی تەنگانەی موسڵماناندا هاودەستیی بێباوەڕانی قورەیشیان کردووە بۆ لەڕیشە هێنانی ئیسلام، جگە شەڕخوازەکانیان دەنا رێ بەکەسی تریان نەگیراوە، بوونیان لەوڵاتی موسڵماناندا بۆ ئەوە شایەتیی دەدات، ئەوەی سەفەوییەکان بەرانبەر بەوانیان کردبێ تەنیا بۆ سرنجڕاکێشانی مەسیحییەکان بووەو نەریتی مەسیحی و دەسەڵاتدارانی ئەورووپایان دووبارە کردووەتەوەو پەیوەندیی بەئیسلامەوە نییە– وەرگێڕ.

سەفەوییەکانیش بەرانبەر ئەو بانگەوازانە زۆر توونـد مامەڵـەیان دەکرد، بەتایبەت ئەگەر بانگەشەی گەیشتنە دەسەلأتی سیاسیی بووایە.

لەنمونەی ئەو هەواڵانە، دەرکەوتنی پیاوێك بوو بەناوی سەید موحەممەدەوە لە(گەیلان) و بانگەشەی کرد کە مەهدیی چاوەڕوانکراوە(الإمـام المنتظـر)، دوای ئەوەی سەرکەوتوو بوو ژمارەیەکی زۆری مورید لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، بانگەوازی کرد کە مەهدیی چاوەڕوانکراوەو زۆربەی خەڵکی گەیلان لەدەوری کۆبوونەوەو شا عەباس لەزۆربوونی هێزو توانای ترسی لێ نیشت و پێداگربوو بەفێڵێك لەنێوی ببات، سەرەتا دەریخست ئامادەیە ببێتە شوێنکەوتەی، پاشان داوای لێکرد بێت بۆلای تاوەکو بیرو ڕێنماییەکانی بزانێ و ئینجا باوەڕی پێ دەهێنێت، کە هاتە بەردەم سوڵتان، سوڵتان فەرمانی دەستگیرکردنی دا بۆ خۆی و هاوڕێکانی و لەسەر ئەو بانگەوازە بێ بنەمایەی کوشتی[1].

نمونەیەکی تر، میرنشینی(المشعشعية) بوو لەخۆراسان، بنەماڵەیەکی شیعەی توونـدڕەو فەرمانڕەواییان دەکردو یەکێك لەسوڵتانەکانی بەناوی سوڵتان فەیازی موشەعشەعییەوە دژ بەسەفەوییەکان ڕاپەڕیی بوو، سوڵتان ئیسماعیلی یەکەم

---

[1] – زندگاي شاه عباس، ج٣، ص٩١٧– ٩١٨.

لەساڵی١٥١٠ز/ ٩١٤ز بۆی رۆیشت و بەسەریدا زاڵبوو، دەسەلاتی ئەو میرنیشینەش بۆ سەفەوییەکان سەقامگیر بوو[1].

هەروەها شۆڕش گەلێکی دیکەی ئاینیی روویاندا، گرنگترینیان شۆڕشی ئێزیدییەکان بوو(ئاینێکی کۆنەو ئێستا لەباکووری عێراقدان)دژ بەسوڵتانی سەفەوی لەسەرەتای دروستبوونی سەفەوییەتدا، بەسەرکردایەتیی پیاوێك بەناوی(شیر صارم)، سوڵتان ئیسماعیل بۆی بەرێکەوت بۆ ناوچەی"سورلوك"و ژمارەیەك لەهەڵگەڕاوانی کوشت و بەسەریاندا زاڵبوو، کاروبار بۆ سوڵتانی سەفەویی سەقامگیر بوو[2]، بزووتنەوەی نقوتییەکانیش نمونەیەکی دیکەی ئەو بانگەوازو شۆڕشانە بوو کە لەکۆتاییدا شکستیانهێناو لەبەشی مامەڵەکردن لەتەك گرووپە سۆفییەکان قسەمان لەبارەوە کرد.

---

[1] - دین و سیاست در دوره صفوي، ص٨٧– ٨٩.

[2] - دین و سیاست در دوره صفوي، ص٨٤– ٨٧.

# دیمەنی سۆفیگەری و فەلسەفیی لەسەردەمی سەفەویدا

"د. حەیدەی عەبدولمەناف ئەلبەیاتی* "

گەشەی فەلسەفی و سۆفیگەرانە، بەیەکێك لەڕواڵەتە سەرەکییەکانی سەردەمی سەفەوییەت دادەنرێ(١٥٠١- ١٧٣٥ن) کە ئەسفەهانی شارو پایتەختی سەفەوییەکان ڕێنسانسێکی زانستیی گەورەو چالاکییەکی ڕۆشنبیریی بێ وێنەی بەخۆوە بینی، ئەو چالاکییەش تەنیا بەسەر شاری ئەسفەهاندا کورت نەهاتەوە، بەڵکو تێپەڕی بۆ شارگەلێکی دیکەی ئێران نمونەی شیرازو قەزوین و تەبرێزو کاشان، لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆری فەیلەسوف و عاریف و شەرعناس و فەرموودەناس دەرکەوتن، سەرباری هەندێ

* - لێکۆڵەرو نووسەری عێراقی، مامۆستا لەقوتابخانە ئاینییەکانی شیعەدا.

مەزهەبی سۆفیگەریی و خانەقاکانیان[1]، ئێمەش لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵ دەدەین رواڵەتی فەلسەفی و سۆفییانەی سەردەمی سەفەوییەت بخەینەڕوو بەدیاریکراوی.

ئێران بەیەکێك لەپەناگا بنەڕەتییەکانی دەرکەوتنی قوتابخانە سۆفیگەرییەکان و بڵاوبوونەوەیان دادەنرێت لەولاتانی دیکەی ئیسلامیدا، باکگراوندی ئایینیی ئێران لەپێش ئیسلام و هەوڵی دەرچوون لەبەرتەسکیی دەقە ئایینییەکان، هۆی ئەوەمان بۆ رووندەکەنەوە کە بۆچی بەدەمەوەچوونێکی گەورە هەبووە بۆ ئەو قوتابخانانە لەئێراندا.

ئاژاوەو نائارامییە سیاسییەکان و داگیرکردنی ئێران لەلایەن نەتەوەکانی دەوروبەرەوە، هۆکار بوو لەبڵاوبوونەوەی سۆفیگەریی لەو وڵاتەدا، بەتایبەت دوای داگیرکاریی مەغۆل لەنیوەی سەدەی سیانزەی زایین، ئێرانییەکان لەو مەزهەبانەدا چارەسەری ئارامبەخشیان بۆ ئازارو مەینەتییەکانیان دەدۆزییەوەو لەمەینەتییان کەم دەبوویەوە، بۆیە خانەقا سۆفییەکان لەهەموو شوێنێکدا

---

[1] – خانەقا: شوێنی خەڵوەتگرتن و پەرستشی سۆفییەکانەو کارە ئایینییەکانی خۆیانی تیادا ئەنجام دەدەن لەسەماو گوێگرتن و شتانی تر.

بڵاودەبوونەوەو بەشوێنکەوتەو موریدەکان ئەڵقەی زیکرەکان پڕ دەبوونەوە[1].

## تەریقەتە سۆفییەکان

بنەماڵەی سەفەوییەت خاوەن گرنگترین مەڵبەندە سۆفیگەرییەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران بوو، لەوپەڕی وڵاتی هاوسێوە شوێنکەوتەی هەبوو، لەوانەش ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیشدا بوون، بەڵام تەریقەتی سەفەوییەت کە تەریقەتێك بوو بۆ پاڵفتەکردنی دەروونەکان گۆڕ بۆ قەوارەیەکی سیاسیی بۆ گەیشتنە دەسەڵات و پارێزگاریکردنی.

سەفەوییەکان بەپشت بەستن بەهێزی شوێنکەوتەی خانەقای سەفەوییەت کە بەقزلباشەکان ناسراوبوون، توانیان دەوڵەتەکەیان دابمەزرێنن[2]، سەفەوییەکان ناوبانگیی پیرۆزی باوك و باپیرانی خۆیانیان بەکاربرد بۆ گەیشتنە دەسەڵات،پیرۆزیی ساداتی خانەقای سەفەوی، هەروەك بنەماڵەی سەفەوییەت لەپێش دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان لەمەزهەبی سوونییەوە بوونە شیعە، ئەوەش لەبەر ئامانج گەلێکی سیاسیی بوو، بەئامانجی دەستخستنی پشتگیریی و

[1] - عبد الصمدي، محمود، سيرى در تصوف وعرفان إيران، ص٥٦– ٥٧.

[2] – قزلباش وشەیەکی تورکییە، لەدوو وشەی لێکدراو پێکهاتووە، واتا: سەر سوورەکان، چونکە مێزەری سووریان بەسەرەوە دەبەست و دوانزە پێچی هەبوو، وەك ئاماژەیەك بۆ دوانزە ئیمامەکە.

پاڵپشـتیی شـوێنکەوتەی مەزهەبەکـە کـە ماوەیـەکی زۆر لەناوچـە جیاوازەکانی ئێراندا بەدەمەوەچوونێکی بەرفراوانی بۆ هەبوو.

قزلباشـەکان دوای دامەزرانـدنی دەوڵـەتی سـەفەوییەت، بـاڵاترین پۆستی دەوڵـەتی نوێیـان وەرگـرت، تـەوژمی فـەرمانڕەوا تـەوژمێکی سۆفییانەی پڕ بوو بەبیری شیعەی توونـدڕەو، قزلباشـەکان بەچـاوی خواییەتییەوە دەیانڕوانییە شای سەفەوی، بەتایبەت شـا ئیسـماعیل و بەدەرکەوتنێکی خواییانەیان دەبینی و بەپێگەی ویلایەت و نیگـا و زۆرێك بیروباوەڕی دیکەی حلولی و ئیتیحادو گیانگۆڕکیّ(التناسـخ)[1] و نازناوی(رابەری کامـڵ) و (سـۆفیی مـەزن)یان پـیّ دابـوو، بەوپێیـەی شێخی تەریقەتی سەفەوییە، لەخۆشەویسـتیی رابـەردا رۆچـووبوون و توابوونـــەوەو دیـــاردەی کڕنـــۆش بـــۆ بردنـــی دەرکـــەوت و خـــاکی بەردەسـتی ماچـدەکرا[2] ئـەوەبوو کـە شەرعناسـە شـیعەکانی لەسـەر تووڕبوون.

بوونی سۆفیگەریی ئەو سەردەمە تـەنیا لەسـەر شـوێنکەوتەکانی تەریقەتی سـەفەویی کـورت نەهاتبوویـەوە، بـەڵکو تەریقـەت گـەلێکی تریش هەبوون ئامادەییـەکی چـالاکیان هـەبوو لەکۆمەڵگـەی ئێرانـدا، مامەڵەی دەسەڵات لەگەڵ ئەو تەریقەتانـە بـۆ هەنـدێکی پشـتگیری و

---

[1] - زرين كوب، عبدالحسين، دنباله جستجودر تصوف إيران، ص٢٢٧، هەروەها بڕوانە: سيوري، راجـر، إيران عصر صفويه، ص٢٠– ٢١.

[2] - تميم داري، أحمد، عرفان وادب در عصر صفوي، ج١، ص٦٢.

هەندێکی تری دوورخستنەوەو ڕاوەدوونان و تا ئاستی لەنێو بردنیش بوو، گرنگترین تەریقەتە سۆفییەکانی ئەوکاتە ئەمانە بوون:

**تەریقەتی (نیعمەت اللهیـە):** شـوێنکەوتەکانی شـێخ نیعمەتواللـە ئەلوەلیی بوون(ك١٤٣١ز)، شـێخەکانی ئـەم تەریقەتـە بەپۆسـتەکانی دەوڵەتەوە پەیوەست بوون و پێگەیەکی گەورەیان هەبوو لەکۆشـکی سـەفەویداو مـیر عەبـدولباقی ئەلیـەزدیی شـێخی تەریقەتەکـە لـەو ڕۆژگارەی شا ئیسماعیلدا گەیشتبووە پۆستی بـالاّ ، بـەلاّم لەشـەڕی چاڵدێراندا کـوژراو لـەدوای خـۆی شـا نیعمەتواللـەی دووەمـی کـوڕی حکومەتی شاری یـەزدی گرتەدەسـت و پەیوەنـدیی ژنوژنخوازیشـیی لەگەڵ بنەماڵەی سەفەوییەتدا هەبوو، بەوەش بۆ ئەو تەریقەتە لـەبار بوویـەوە لەدەوڵـەت نزیکبێتـەوە تـاوەکو بـووە یـەکێك لەلقـەکانی سەفەوییەت و بەهۆی مەیلی شـێخەکانی بـۆ دەسـەلاّت، تەریقەتەکـە سرووشتی ڕوحیی و مەعنەوییانـەی خـۆی لەدەسـت داو بـووە هـۆی کۆستێکی گەورە، چونکە هەنـدێ کەسایەتیی تەریقەتەکـە لـەنێوبرا کاتێك شـا صـەفیەدین بـەهۆی گومـانی خراپـی بەرانبـەریان هەنـدێ میری دەوڵەتی سـەفەوییەتی کوشـت و ئەشـکەنجەی هەنـدێکی تـری دا[1].

---

[1] - سەرچاوەی پێشوو، ل٦٥– ٦٧.

**تەریقەتی نوربەخشی:** شوێنکەوتەی موحەممەدی کوڕی عبدالله بوو خاوەن نازناوی(نور بەخش)(ك١٤٦٥ز)، ئەمیش تەریقەتێکی تر بوو کە توانی دۆستایەتیی بنەماڵەی فەرمانڕەوا دەستبخات و بەهەوڵەکانی شەمسەدین لاهیجیی لەشیرازدا زۆر بەرفراوان ببێتەوە، هەروەك قازیی ئەسەدو الله ئەلقەهبانیی لەسەردەمی لوتکەی دەسەڵاتی سەفەوییەتدا توانی بانگەوازەکە بگەیەنێتە کاشان، هەروەها بنەماڵەی نوربەخشییەکان دەسەڵاتێکی گەورەیان لەشاری رەی بەدەستخست، بەهۆی گرنگی پێدان و رێزگرتنی شا ئیسماعیل بۆیان[1].

**تەریقەتی زەهەبی(ئاڵتوونی):** شوێنکەوتەی (میر شەمسەدین عبدالله برزش ئابادی)بوون، تائاستێك زیندوو کراوەتەوە، قوتبەدین شیرازیی لەڕۆژگاری شا حوسێنی کۆتا پادشای سەفەوییەکان شوێنکەوتەو موریدی هەبوو لەشیرازدا[2].

تەریقەتی سۆفیگەریی دیکە هەبوو لەماوەی سەردەمی سەفەویدا سەرکەوتوو نەبوون، بۆ نمونە شا تەهماسب چاودێریی شوێنکەوتەکانی تەریقەتی نوقتەوەیهیی دەکرد کە هەلگری بیری توندڕەوی و گومڕایی بوون و تەنگی پێیان هەڵدەچنی، بەلام نەیتوانی لەنێویان ببات[3]، تاوەکو شا عەباسی یەکەم هات و یوسف

---

[1] – هەمان سەرچاوە، ل٦٩٧، ٧١.

[2] – زرین کوب، عبد الحسین، ارزش میراث صوفیه، ص٩٨.

[3] – تمیم داري، أحمد، عرفان وادب در عصر صفوي، ج١، ص٧٤.

تورکش دوزی یەکێك لەقوتبەکانی تەریقەتی کوشت و فەرمانی دا بەکوشتنی هەموو شوێنکەوتەکانی تەریقەتی نوقتەوەیهی لەقەزوین و ئەسفەهان و ساوەو کاشان و شیراز هەموویانی لەنێوبرد[1].

## رەوتی سۆفیگەریی لای شەرعناسان

رەوت و مەیلی سۆفیگەریی لەنێو کۆمەڵێ لەشەرعناسانی شیعەش بەربلاو بوو، لەوانە:

**ئەلبەهائیی ئەلعامیلی:** (ك١٦٢٢ن)[2] هەستێکی سۆفیانەو عاریفانەی ناسکی هەبووە، لەکتێبەکەیدا(الکشکول) بابەتی زۆر هەیە لەبارەی تەصەوف و عیرفانەوەو توانیویێتی رێزی تەواوی تەریقەتە سۆفییەکان دەستبخات و ببێتە جێی گرنگیپێدانی هەموویان و هەموو تەریقەت و گرووپەکان بەهی خۆیانی بزانن، وەك تەریقەتی نوربەخشیی کە بەئینتیمابوونی بۆ ئەو تەریقەتە تۆمەتبار کراوە[3].

---

[1] - عبد الصمدي، محمود، سيري در تصوف وعرفان ايران، ص٨١- ٨٢.

[2] - ئەلبەهائی، شەرعناسێکی شیعەی بنەچە عەرەبی زانایانی شیعە بوو، کۆچکەرانی جەبەل عامیل بۆ ئێران، لەبوارە هەمەجۆرەکانی زانستە ئیسلامییەکان و ئەوانی تردا بەتایبەت زانستی تەلارسازیی زانا بوو، گەورەیی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە لەنوێکردنەوەی شاری ئەسفەهان و دروستکردنی مزگەوت و کۆشك و باخچەکانی ئەو شارەو ناوەدانکردنەوەیان.

[3] – نعيم داري، أحمد، عرفان وادب در عصر صفوي، ج٢، ص٦٧٩.

**موحەممەد تەقیی ئەلمەجلیسی:** (ك١٦٥٩ز)، لەسەر دەستی شێخ ئەلبەهائیی خوێندبووی و مەیلی هەبووە بۆ زوهد(دونیا بەکەمگرتن) و لەخۆگرتنەوە لەبەرگ و خۆراك، باس دەکرێ کە هەندێ سرووتی سۆفییانەی کردووە وەك چلەیی و هەندێ سۆفیش بەیەکێك لەخۆیانی دادەنێن، هەروەك باوەڕی هەبوو بەکەشف و بینین و کەرامات کە دەکرێ بەیەکێك لەگرنگترین تایبەتمەندییەکانی بیری سۆفی و عیرفانیی دابنرێت.

**موحەممەد باقر ئەلمەجلیسی:** (ك١٦٩٩ز) کوڕی ئەلمەجلیسییە کە لەپێشەوە باسمان کرد، لەدوژمنە سەرسەختەکانی سۆفیگەریی بووە و بەتوندیی رەتیکردووەتەوە باوکی سۆفیی بووبێ و بوونی دیاردەی تەصەوف لای باوکی، گێڕاوەتەوە بۆ پابەندبوونی بەگێڕانەوەکانی ئەهلی بەیت: دونیا بەکەمگرتن و وەرع و جیهادکردنی دەروون.

ئەلمەجلیسیی پاساوی تێکەڵیکردنی باوکی لەگەڵ سۆفییەکاندا بەوە هێناوەتەوە کە ویستوویەتی رێگەی راستیان پیشان بدات، کە بینیویێتیی هەندێکیان شیاوی هیدایەت نیین خۆی لێیان بەدوور گرتووە، تەنانەت بەبێباوەڕیانی زانیووە.

لەڕاستیدا زۆربەی خەڵك بەهۆی هێزی تەوژمی دژە سۆفیانەوە باوەڕیان بەئەلمەجلیسیی باوك نەبووە تاوەکو ئەلمەجلیسیی کوڕ

هات و باوكی لەتۆمەتی سۆفیبوون دوورخستەوە، ئینجا خەڵك متمانەیان پێكردو كتێبەكانیان دەخوێندەوە[1].

**مەلا موحسین ئەلفەیض ئەلكاشانی:** (ك١٦٧٨ز)، لەو زانایانە بوو كە مشتومڕی زۆری هەبوو لەسەردەمی سەفەویدا، جارێگ لەدیمەنی هەواڵگێڕەرەوەدا دەردەكەوت و جارێك لەدیمەنی خواپەرست و جارێكی تریش وەك سۆفییەكی دونیانەویست، جارێكی تریش وەك فەیلەسوفێكی قووڵبوو توانـاو لێهاتوویی خۆی دەردەخست، لەڕاستیدا ئەلفەیض بەهەموو ئەو قوتابخانانە كاریگەربوو، هەوڵیدا پێكەوە كۆیان بكاتەوە، نەیتوانی ئەو كولتورە فەلسەفییە عیرفانییە لەبیربكات كە لەمامۆستاكەیەوە مەلا صەدرای باوكی خێزانییەوە(ك١٦٤٠ز) وەریگرت، نەشیتوانیی گێڕانەوەو باسەكانیش رەتبكاتەوە، بەتایبەت كە خوێندكاری ماجدی كوڕی هاشمی بەحرانیی بوو كە بیرێكی هەواڵگێڕانەوەی هەڵگرتبوو، كە بەهۆیەوە هەندێك لێی تووڕە بوون، ئەو هەوڵەیان بەكۆكردنەوەی نەگونجاو و هاوجنس نەبووەكان دادەنا.

رەخنەی زۆری كەسێتیی ئەلفەیضی كاشانیی كراوە، نەك لەبەر مەیلە هەواڵسازییەكانی كە لەكتێبەكەیدا(الوافي)دەردەكەوێ كە بووە چەقی لێكۆڵینەوەی ماوەیەك، بەڵكو لەبەر مەیلە سۆفێگەرییەكەی

[1] - جعفریان، رسول، صفویە در عصریە دین وفرهنك رسیاست، ج٢: ص٥٢٩- ٥٢٣.

رەخنەی لێ دەگیرێ و پشتی بەستووەتە هەندێ بۆچوونی ئیبن عەرەبی[1] و غەزالی، کاشانیی هەستاوە بەپوختەکردنی کتێبی(إحیاء علوم الدین)ی غەزالی و شێوەیەکی شیعەییانەی پێ داوەو ناوی لێناوە(المحجة البیضاء في تهذیب الإحیاء).

لەو زانایانەی هێرشی توندی کردووەتە سەر ئەلفەیض، عەلیی کوڕی موحەممەد ئەلشەهیدییە(ك١٦٩١ز)کوڕەزای شەهیدی دووەم(الشهید الثاني)[2]، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، وەها دەردەکەوێ کە بیری ئەلفەیض هەندێ پەرەیسەندووەو مەیلە سۆفیگەریی و باتنییەکەی لەدەیە سەرەتاکانی تەمەنی دەرکەوتووە، بەڵام لەدواتردا مەیلی پێچەوانەی سۆفیگەرێتیی لێ دەرکەوتووە، پەشیمان بووە لەو کتێبانەی کە خۆی نووسیویێتی و مەیلی سۆفیگەرییانەی تێدایە، بەڵام لەبیرە دروست و بونیاتنراوەکانی کۆنی دەستبەرداریی نەکردووەو باکگراوندی بیری بەسەر بیرۆکەی دواتریدا بەزاڵ ماوەتەوە.

شیاوی باسکردنە کە ئەلمەجلیسیی دووەم، خاوەن بیری دژ بەتەصەوف، ئەلفەیضی بەیەکێك لەو زانایانە داناوە کە

---

[1] - نووسەر ئیبن عەرەبیی بەئیبن ئەلعەرەبیی ناوبردووە، راستییەکەی ئیبن عەرەبییە کە دەکاتە موحیەدین ئیبن عەرەبی کە قسەو باسی زۆری لەدژ هەیە لای زانا پایەبەرزەکانی ئەهلی سوونەو بیروباوەڕی بێ کەڵکی هەبووە، جیاوازە لەئیبن ئەلعەرەبیی کە قازیی ئەبو بەکر ئیبن ئەلعەرەبییە، ئێمەش وەك خۆی بەئیبن ئەلعەرەبیی هێشتوومانەتەوەو بەم تێبینییەشمان بابەتەکەمان روونکردووەتەوە– وەرگێڕ.

[2] – المهاجر، جعفر، الهجرة العاملة إلى إیران في العهد الصفوي، ص٢١٠.

مۆڵـەت(ئیجازە)یان پـێ داوە وەسـفی کـردووە بە(مـەولای پایەبـەرز زانای عاریفی رەبانیی گەورەمان موحەممەد موحسین ئەلکاشانی)[1].

## بەرهەڵستیکردنی تەصەوف

بـا بگەڕێینـەوەو بەشـێوەیەکی گشـتیی لـەبارەی تەصـەوفەوە بدوێین، بێگومان سەردەمی سەرەتای سەفەوییەت، سەردەمێکی پـڕ بـەڕوحی سـۆفیگەریی بـوو کـە سـەفەوییەکان لـەکاتی بوونیاتنـانی دەوڵەتەکەیاندا پشتیان پێ بەست، سـەفەوییە قزلباشـەکان تـەواوی سـەنتەرەکانی هێـزی ئـەو ولاتـەیان داگیرکـرد، بەوپێیـەی خـاوەن گەورەیی بـوون لـەو دەوڵەتـەداو لەسـەر شـانی ئـەوان ئـەو دەوڵەتـە دروست بووە، جا بەو ئیعتیبارە بوو هـەوڵیان دەدا بەهـەر شـێوازێك بێـت گـەورەترین پـارەو دەسـکەوتی سیاسـی و کۆمەلایـەتیی دەسـتبخەن، تاگەیشـتە هەلایسـانی نـاکۆکیی نێـوان خۆیـان، وەهـا دەردەکەوێ کە دەسەلاتداربوون ئەوپەڕی ئارەزوویـان بـووبێ، بۆیـە کاریان گەورە بوویەوە تاوەکو بەوە گەیشت دژ بەسوڵتانی سەفەویی هەڵگەڕێنەوە کە نازناوی رابەڕی کاملی لایان هەبوو.

لەسـەردەمی شـا تەهماسـبی یەکەمـدا(لە١٥٧٦ز) یـەکێك لەمیرەکانی هۆزی(تکلو) هەڵگەڕانەوەیەکی ئەنجام دا، پاشان پەنای بردەبـەر سـوڵتانی عوسمـانی، سـوڵتانی عوسمـانیش هـانی دەدا بـۆ

[1] - المجلسي، محمد باقر، بحار الأنوار، ج١٠٧، ص١٢٤.

پـــەلاماردانی ســـــەفەوییەکان، دوای ماوەیـــەکی کـــورت مــــیری هۆزی(شـاماو) هەسـتا ژەهرخـواردی شـا بکـات، بـەلاّم هەوڵەکـەی شکستیهێناو ناکۆکیی نێوان قزلباشـەکان بـەوە گەیشـت شـێخ زادە حەیدەر مـیرزای کـوڕو جێنشـینی شـا تەهماسـب بکـوژرێ، ئـەوەش وەهــای کــرد پادشــا ســەفەوییەکان لــەدژیان بووەســتنەوە[1]، شــا تەهماسـب هــەوڵی تــەمبێکردنیانی دا، بــەلاّم نــەیتوانی، تــاوەکو شـا عەباســی یەکــەم هــات و هێزێکــی نــوێی بوونیاتنــا بەناوی(شــاه سون)واتا(خۆشەویستانی شـا)و بـەوە تـوانی سـنووری قزلباشـەکان رابگرێ[2].

هەڵســوکەوتی قزلباشـــەکان بـــووە هـــۆی گـــۆڕینی سیاســـەتی پادشایانی سەفەوییەت بەرانبەریان. سـەفەوییەکان دەسـتیان کـردە گـەڕان بـەدوای ئـەو شەرعناسـانەی دژ بەتەصـەوف بـوون تـاوەکو جڵـەوی تـەواوی دامـەزراوە ئایینییـەکان وەربگـرن، شـا تەهماسـب لەلوبنانــەوە شەرعناســانی بانگهێشــت کــرد، بەتایبــەت لە(جەبــەل عامیل)، شەرعناسـە لوبنانییـەکانیش توانیـان بزووتنـەوەی فیکریـی لەئێرانــدا دابرێــژن، ئــەوەش بــەپێی ئــەو پێــوەرە فیقهییانــەی دژ بەتەصــەوف بــوو، لەڕاستیشــدا لــەنێو زانایانــدا دوو تــەوژمی دژ بەتەصەوف دەرکەوتن:

---

[1] - زرین کوب، عبد الحسین، دنباله جستجودر تصوف إیران، ص٢٣١.

[2] - ذكاوتی قراكزلو، علی رضا، جنبش نقطویه، ص١٠٩.

**یەکـــەم: جیاکردنـــەوەی نێـــوان تەصـــەوف و عیرفـــان:** مـــەلا صەدرا(ك١٦٤٠ز) یەکێك بوو لەکەسە سەرەکییەکانی ئەم ئاراستەیە، کتێبە بەناوبانگەکەشی نووسـی(کسـر أصـنام الجاهلیـة – شـکاندنی بتەکانی نەفامیی) و تیایدا هێرشی کردە سەر تەصـەوفی بازاڕیانـەی تێکـەڵ بەبیدعـەو شـتی دژ بـەئایین بـەپێی دەربڕینـی خـۆی، ئەڵێ:"کۆمـەڵێکم بینیـووە لـەکوێرو نـەفام و سەرشـۆڕ بانگەشـەی زانسـتی مەعریفـەو بینینـی حـەقی یەکـەمیان کـردووە، هـەروەها گەیشتنە مەقامات و خوای پەرستراو و بینینی شـتە نـەبینراوەکان و بـەبینینی سـەرمەدیانە سـەرکەوتوو بوونـەو فـەناو مانـەوەیان دەستخستووە، سوێندبێ جگە نـاو دەنـا لـەواتای هـیچ شـتێکی ئـەو بوارانەیان نەزانیووە"[1].

مەلا صەدرا هۆی هێرشکردنی بۆ سەر ئەو کەسانە، گێڕاوەتـەوە بـۆ نەشـارەزاییان بەمـەعاریف و پابەنـد نـەبوون بەئامۆژگارییـەکانی ئایینەوە[2]، لەکۆتایی کتێبەکەیدا، لەبارەی ئامانجی لەنووسـینی ئـەو کتێبـەوە ئەڵێ:"وریاکردنـەوەی ئـەو کەسـەیە کـە زەوقـی جـوان و دڵێکی ساغی هەیە لەسـەر خراپـەی زەمـان و لادانـی زۆربـەی خـەڵك لەهەڵسـوکەوتی جـوان بـۆ گەیشـتنە ڕێگـەی زانسـت و عیرفـان"[3]،

---

[1] - صدر الدين الشيرازي، محمد بن إبراهيم، كسر أصنام الجاهلية، ص٦- ٧.

[2] - هەمان سەرچاوە، لا٥٠.

[3] - هەمان سەرچاوە، لا٢١٧.

بەوەش مەلا صەدرا جیاوازیی کردووە لەنێوان تەصەوف و عیرفان، هێرشی کردووەتە سەر تەصەوف و بەشتێکی خراپی زانیووەو لەتەواوی کتێبەکانیشدا بەرگریی لەعیرفان کردووە، بەتایبەت لەکتێبەکەیدا(الأسفار الأربعة– چوار سیفرەکە)و بەشتێکی باشی داناوە، خوێندکارەکانیشی بەهەمان ئەم رێگەیەدا رۆیشتوون و تەصەوف بووەتە هەڵسوکەوتی خراپ، عیرفانیش بووەتە هاوواتای هەڵسوکەوتی راست، ناونیشانی تەصەوفیش بووەتە کارێکی قێزەون و ناشیرین.

**دووەم: رەتکردنەوەی رەهایانەی تەصەوف و عیرفان:**

لەئەنجامی زیاتربوونی هێزی شەرعناسان و بڵاوبوونەوەی رەوتی هەواڵگێڕەرەوان(الإخباري)، ئەم رەوتە دەرکەوت.

ئەم رەوتە جیاوازیی نەکرد لەنێوان تەصەوف و عیرفاندا، واتا لەنێوان هەڵسوکەوتی راست و هەڵە، ئەمەش وەهای کرد رەتکردنەوەی تەصەوف عیرفانیش بگرێتەوەو عیرفان و عاریفانیش سەرزەنشت دەکران و وریایی دەدرا کە رێگەی ئەوان نەگرنەبەر، وەك مەلا صەدراو ئەوانی تر، ئەوەش تەنیا لەبەر پابەندبوونیان بەعیرفان و بەرگری کردن لەعیرفان بوو، تاوەکو گەیشتە ئاستی بێباوەڕکردنیان، پەلامارەکان لەو ئاستەدا نەوەستانەوە، بەڵکو بەهۆی بوونی هاونزیکییەك لەنێوان فەلسەفەو عیرفانەوە، پەلاماری

فەلسەفەش دەدرا، بەتايبەت دوای ئەوەی مەلا صەدرا هەستا بەلێکدانی ئەنجامی لێکۆڵینەوەی فەلسەفیی و عیرفانی تیۆرییەوە.

لەئەنجامی ئەو دوو تەوژمە بەهێزەی دژ بەتەصەوف، زۆرێك نامەو کتێب بەزمانی عەرەبی و فارسیی نووسران، وەك کتێبی(حديقة الشيعة) کە دەدرێتەوە پاڵی ئەلمەقدیس ئەلئەردەبیلی، نامەی(الفوائد الدينية)ەی موحەممەد تاهیر ئەلقومی،کتێبی(السهام البارقة)ی عەلیی ئەلعامیلی،کتێبی(النفحات الملكوتية)ی یوسف ئەلبەحرانی، (رساله خیراتیە)ی ئاغا موحەممەد عەلی[1]، کتێبی(السهام المارقة من أغراض الزنادقة في الرد على الصوفية)ەی ئەلمەشهەدی[2].

کەسانی خاوەن ئەم هەڵمەتە لەلایەن دەسەڵاتەوە پاڵپشتییەکی گەورە کران، دەسەڵات پێگەیەکی گەورەی دایە زانایانی دژ بەتەصەوف و هەڵمەتی لەنێوبەری دەکردەسەر شوێنکەوتەکانی هەندێ تەریقەتی سۆفیگەریی، هەروەك بەرانبەر شوێنکەوتەکانی تەریقەتی نوقتەوەیهیی کردی.

تەصەوف نەیتوانی بەرەنگاری ئەو فشارانە بێتەوە، بۆیە لەبەردەم ئەو پەلامارە توندانەی دەکرایە سەری‌ڕۆچوایەوە، چونکە هەوڵی زانایان و دەوڵەتیش لەدژی کۆببوونەوە، تاوەکو سەدەی

---

[1] - بجنوردي، دائرة المعارف بزرك إسلامي، ج٨، ص٤٨٠.

[2] – تميم داري، أحمد، عرفان و ادب در عصر صفوي، ج١، ص٤٩.

حەفـدە هـات لەزۆربـەی شـارەکاندا سـۆفییەك نەدەبینرایـەوە، خانـەقاکان بوونـە شـوێنەوارو باسـی ئـەوەی لـەبارەوە دەکـرا کـە ڕۆژگارییەك هەبووە پڕ بووە بەشوێنکەوتەو خـاوەن هێـزو دەسـەڵات بوونــە، ئـیبن ئەلکەربەلائی(مێژوونووسـی سۆفی)باسـی لەیـەکێك لەگۆشـەی سـۆفییەکانی ئـەو سـەردەمە کـردووەو ئـەڵێ کـە نـە لـەو شوێنەو نە لەهیچ شوێنێکی تر دەروێشێکی تیادا نادۆزرێتەوە[1].

لێـدانی توونـدی تەصـەوف لەسـەر دەسـتی موحەممـەد بـاقر ئەلمەجلیسـیی بـوو(ك١٦٩٩ز) کاتێـك لەکۆتاییـەکانی سـەردەمی عوسمانیدا بووە شێخی ئیسلام و توانیی دەسەڵاتی بەرفراوانی خۆی بەکاربهێنێ بۆ نەهێشتنی پاشماوەی تەصەوف لەئێراندا.

ئـەو هۆکارانـەی کـە بوونـە یارمەتیـدەری نەهێشـتنی تەصـەوف لەئێراندا، دەکرێ بەم شێوەیەی خوارەوە پوختیان بکەینەوە:

یەکـەم: ڕەوشـتی خـراپ و هەڵگەڕانـەوەی قزلباشـەکان کـە مەترسییان بۆ سەر دەوڵەت دروستکردبوو.

دووەم: زۆربەی سۆفییەکان بەئەحکامـەکانی ئیسـلامەوە پابەنـد نەبوون.

سێیەم: تەریقەتی سەفەوییەت هەوڵیدا تەصەوف لەبەرژەوەندیی خۆیدا بەکاربهێنێت، بۆیە تەریقەتەکانی تری لەنێوبرد.

---

[1] – حداد عادل، دانشنامه جهان إسلام، ج٧، ص٣٩٠.

## چوارەم: هێزی زاناو شەرعناسانی دژ بەتەصەوف[1].

### دیمەنی فەلسەفی

لەسەردەمی سەفەوییەتدا فەیلەسوف گەلێکی گەورە دەرکەوتن و لەدوای ماوەیەکی زۆری خامۆشی و چەقبەستن توانیان کولتووری فەلسەفیی زیندووبکەنەوە، دیارترین ئەو فەیلەسوفانەش ئەمانە بوون:

### میرداماد

ناوی: موحەممەد باقرِ میرداماد ئەلحوسێنیی ئسترئابادیی ناسراو بەمیر دامادە(ک١٦٣١ن) و لەگرنگترین فەیلەسوفەکان دادەنرێت، نازناوی(میرداماد)واتا زاوا، باوکی زاوای ئەلکەرکیی شێخی ئیسلام بووە، کەرکیی باپیری میرداماد بووە، باوکی دایکی بووە، میرداماد بەگەورەترین فەیلەسوفەکانی سەردەمی خۆی دادەنرێ و لەڕیزی گەورە فەیلەسوفانی ئیسلام باسدەکرێ و نازناوی مامۆستای سێیەمی پێ دراوە، فارابیی مامۆستای دووەم و ئەرستۆش مامۆستای یەکەم، هەر خودی خۆی ئەمەی دووبارە کردووەتەوە"هاوبەشمان لەم فێربوونەدا ئەبو نەصری فارابییە"[2]،

---

[1] - سەرچاوەی پێشوو، ج٧، ص٣٨٩- ٣٩٠.

[2] - حسيني كوهساري، اسحاق، تاريخ فلسفه إسلامي، ص٢١٥.

بەلآم لەلیستی مامۆستاکانیدا مامۆستایەکی دەرکەوتەی بواری فەلسەفە نابینینەوە بگونجێ لەگەڵ ئاستی میرداماددی خوێندکاردا، ئەمەش ئیبن سینامان بیردەخاتەوە.

میرداماد بەهرە گەلێکی دیکەی دەگمەنی هەبووەو گەیاندوویەتییە ئاستی گەورە فەیلەسوفان[1].

ئەگەرچی سەربە رێبازی(مەشائي) و سەر بەبیری ئیبن سینا دانراوە،بەلآم رێبازی ئیشراق و بیری سوهرەوەردیی لێی شاراوە نەبووە، دەکرێ لەکتێبەکانی میرداماددا جێ پەنجەی فەیلەسوفی ئیشراق ببینین[2]، ئەوەشە مەیلە عیرفانییەکان دەردەخات کە بیری ئەو دانایەی نەخش پێ کردووەو لەشیعریدا ئیشراق دەرکەوتووە، فەلسەفەی میرداماد گێڕانەوە شیعەکان دووپات دەکاتەوەو سرووشتێکی شیعەییانەی بەمەزهەبە فەلسەفییەکەی داوە، ئەم شێوازەش گوازراوەتەوە بۆ مەلا صەدرای خوێندکاری، خاوەن قوتابخانەی(الحکمة المتعالیة).

میرداماد کتێبی(الرواشح السماوية في شرح أحاديث الإمامية)ەی نووسیوەتەوە، لەو کتێبەدا فەرموودەو باسە شیعەییەکانی هەڵبەستووەو بیری فەلسەفیی تێکەڵ کردووە، بەبیری فەلسەفیی راڤەو قسەی لەسەریان کردووە[3].

---

[1] - ابراهیمی دیناني، غلام حسین، ماجرای فکر فلسفي در جهان إسلام، ج۲، ص۳۰۲.

[2] – هەمان سەرچاوە، لا۳۰٤.

[3] - ابراهیمی دیناني، غلام حسین، ماجرای فکر فلسفي در جهان إسلام، ج۲، ص۲۰۲– ۲۰۳.

تیۆری روودانی سەردەمیانە(الحدوث الدهري) بەگرنگترین تیۆری فەلسەفیانەی داماد دادەنرێ، کە لەڕێگەی ئەو تیۆرەوە هەوڵی داوە بگاتە چارەسەری ململانێی مێژوویی دروستبووی نێوان موتەکەلیمین و فەیلەسوفانەوە لەبارەی روودان و دروستبوونی جیهانەوە، موتەکەلیمین پێداگرن لەسەر دروستبوونی زەمانەوە ئەگەر گریمانەییش بێ زەمەنێك هەبووە ئەم جیهانەی تێدا بوونی نەبووە، بەڵام فەیلەسوفان پێداگرن لەسەر روودانی خودکارانەی جیهان و فەیزی ئیلاهیی هەرگیز دابڕاو نەبووەو زەمەنێك نەبووە جیهانی تێدا بوونی نەبووبێ، بەڵکو روودان و دروستبوونی جیهان واتا هەموو شتێك جگە خوای گەورەو بوونی لەخوای گەورەوە وەرگرتووەو ئەوەشە ناودەبرێ بەڕوودان و دروستبوونی خودکاری(ذاتي).

میرداماد هەوڵی داوە کۆبکاتەوە لەنێوان قسەی فەیلەسوفان بەوەی هەرگیز فەیز نەپچڕاوە و لەنێوان ئەوەی موتەکەلیمین وتوویانە کە جیهان پێشتر واقیعیانەو روون بوونی نەبووە، بۆیە تیۆری(الحدوث الدهري)هێناوە[1] کە ئەڵێ هەر ئاستێك لەئاستەکانی جیهان، لەدۆخێکی تایبەت بەخۆیەتی، جیهانی مادده ئەکەوێتە دۆخی زەمەنەوە، جیهانی ئەبستراکیش ئەکەوێتە دۆخی دەهرەوە(رۆژگارو سەردەم)، خوای گەورەش لەدۆخی سەرمەدیدایە.

---

[1] - آشتياني، جلال الدين، منتخباتى از آثار حكماى الهى ايران،ج١، ص٢٦.

ئەگەر لەنێوان جیهانی ماددەو دۆخی دەهردا بەراورد بکەین، دەبینین لەو دۆخەدا جیهانی ماددە بوونی نەبووە، واتا لەپێش جیهانی ماددە دەهر هەبووە، ئەوەیە کە پێی وتووە(الحدوث الدهري).

هەندێ فەیلەسوفی سەردەمی سەفەویی هاوبەشی ئەم بۆچوونەی نەبوون، خوێندکارەکانی مەلا صەدرا رەخنەیان لێگرت لەنمونەی لاهیجی و فەیضی کاشانی و موحەممەدی کوڕی عەلی رەزای راڤەکاری دیارترین کتێبی میرداماد کە کتێبی(القبسات)بوو، ئاغا جەمال خونساریش نامەیەکی نووسی و رەخنەی گرت لەبیرۆکەی(الحدوث الدهري)[1].

میرداماد تیۆرگەلێکی تری هەیەو بەخێرایی ئاماژەیان پێ دەدەین:

١- بنەچەی جوولەی کۆتایی(القطعية) لەبەرانبەر جوولەی نێوەند(التوسطية).

٢- تێگەیشتنی تایبەتی نمونەی نورانی.

٣- سەلماندنی بنچینەو رەسەنێتی چییەتی[2].

[1] - ابراهيمى ديناني، غلام حسين، ماجراى فكر فلسفي در جهان إسلام، ج٢، ص٢٠٧- ٣١٢.

[2] - خامنەای، محمد، ميرداماد، ص١١٦.

هەروەها باوەڕی وەها بوو کە دە وتەکە(المقولات العشر)هی ئەرستۆ نییە، بەڵکو هی کەسێکی ترە بەناوی(ئەرخوتس) و خوێندکاری فیساغۆرس بووە[1].

لەگرنگترین خوێندکارەکانی میرداماد، مەلا صەدرا بوو کە کەمێکی تر لەبارەیەوە دەدوێین، خوێندکاری تریشی هەبوو کە گرنگترینیان ئەمانە بوون: ئەحمەدی کوڕی زەینولعابدین ئەلعەلەوی(کۆچکردووی نێوان سالآنی١٦٤٤و ١٦٥٠ز)کە هەندێ کتێبی ئالۆزی مامۆستاکەی خۆی راڤە کردووە، هەروەك کتێبی(الشفاء)ی ئیبن سینای راڤەکردووەو ناوی لێناوە(مفتاح الشفاء)، هەروەها موحەممەدی کوڕی عەلیی رەزای کوڕی ئاغاجانی(آقاجانی)کە لەهەزارو دوو سەد لاپەڕەدا کتێبی(القبسات)ی مامۆستاکەی راڤەکردووە، هەروەها قوتبەدین موحەممەد ئەشکوریی ناسراو بە(الخطيب اللاهجوري)(کۆچکردووی دوای ساڵی١٦٦٤ز) کە کتێبی زۆری هەیە لەفەلسەفەو عەقائیدو تەفسیر، هەروەها مەلا شەمسای گەیلانی کە بۆ چەند ساڵێك ئامادەی وانەکانی میرداماد دەبوو، لەکۆمەڵێ نامەی فەلسەفیدا بیری مامۆستاکەی راڤە کردووە، زۆر دەگەڕاو گەشتی دەکرد، تەواوی ناوچەکانی ئێرانی گەڕاوە سەرباری عێراق و سوریاو حیجاز، سەرەڕای جیاوازیی بۆچوونی لەگەڵ هاوڕێ تەمەن گەورەترەکەیدا کە مەلا صەدرا بوو، مەلا

---

[1] - ابراهيمى ديناني، غلام حسين، ماجراى فكر فلسفي در جهان إسلام، ج٢،ص٣١٦.

شەمسا بەشوێنکەوتنی مامۆستاکەی دەیووت چییەتی بنەچەو بناغەیە، بەڵام مەلا صەدرا دەیووت بوون بناغەو بنەچەیە، بەڵام ئەم بابەتە هاوڕێیەتیی نێوانیانی تێك نەدا، نامەی دۆستایەتی و خۆشەویستییەکی زۆریان لەنێواندا هەبوو[1].

## میرفندرسکی

یەکێکی تر لەفەیلەسوفانی سەردەمی سەفەوییەت،ئەبو ئەلقاسم میرفندرسکیی بوو(ك١٦٤٠ز) کە زۆرێکی تەمەنی لەگەشتەکانی دەرەوەی ئێران بەسەربرد، بەتایبەت گەشتەکانی بۆ هیند کە لەوێدا زۆرێك داناى ناسی و گرنگیدانێکی تایبەتی ئەوانی وەرگرت و هەندێ دەقی سانسکریتیی بۆ زمانی فارسیی وەرگێڕا[2].

میرفندرسکی مامۆستای فەلسەفەو بیرکاری و پزیشکیی بوو، هەردوو کتێبی شیفاو قانونی ئیبن سینای لەئەسفەهان دەوتەوە[3]، بەڵام ئینیتیما فیکرییەکەی جۆرێك ناڕوونیی دەورەی دابوو، لەلایەکەوە فەلسەفەی مەشائیی دەوتەوەو باوەڕی بەهەموو مەشائییەك هەبوو، جووڵەی جەوهەریی و یەکگرتنی عەقڵ و مەعقوڵ و نمونەی ئەفلاتۆنیی رەتدەکردەوەو لەململانێ لەگەڵ ئیشراقییەکاندا پشتی مەشائییەکانی دەگرت و وەڵامدانەوەی بۆ

---

[1] – کورین، مانزي، تاريخ فلسفه إسلامی، ص٤٧٨– ٤٧٩.

[2] – هەمان سەرچاوە، ل٤٨٠.

[3] – نصر، حسين، سنت عقلاني إسلامي در إيران، ص٢٧٧.

پرسیارێکی موزەفەر کاشیی مەیلی بەلای ئەفکاری ئیبن سیناو فارابیی دووپات دەکاتەوە[1].

لەلایەکی ترەوە ئاماژە گەلێکی تر هەیە بەڵگە دەدات لەسەر بیرو رەوتی ئەفلاتۆنیی لای میرفندرسکی، لەیەکێك لەهۆنراوە بەناوبانگەکانیدا کە بەزمانی فارسیی هۆنیوێتییەوە بەشێوەیەکی زۆر روون مەیلی ئەفلاتۆنییەتی لێ دەبینرێ، لەو شیعرەدا بیرۆکەی نمونە(المثل) و خاوەن بۆچوونانی ئەو جۆرانە دەخاتەروو کە بەبنەماکانی بیری ئەفلاتۆنیی دادەنرێن.

لەگرنگترین خوێندکارەکانی میرفندرسکی، مەلا رەجەب عەلیی تەبریزییە کە رەوتێکی فەلسەفیانەی دژ بەمەلا صەدرا دامەزراندووەو سەر بەفەلسەفەی مەشائییە بووەو باوەڕی بەهاوبەشیی بێژەیی هەیە لەبووونداو جوڵەی جەوهەریی و بنەچەییانەی بوون و نمونەی نورانی و بوونی زیهنیی رەتکردووەتەوە[2]، لەنێو خوێندکارەکانی مەلا رەجەب عەلیدا ناوی قازیی سەعید قومیی دەبینین، کە لەکتێبەکانیدا ئەفکاری مامۆستاکەی خستووەتەڕوو، بەتایبەت لەکتێبەکەیدا(شرح توحيد الصدوق)، هەروەها موحەممەد حەسەن قومیش خوێندکاری بووە

---

[1] - صدر الدين الشيرازي، محمد بن إبراهيم، الشواهد الربوبية، مقدمة جلال الدين الاشتياني، ص٦٦-٦٧.

[2] - حسينى كوهسارى، اسحاق، تاريخ فلسفه إسلام، ص٢٥٣- ٢٥٤.

برای قازیی سەعید بووە، هەروەها مەلا عەباس مەولەوی و مەلا موحەممەد ئەلتکابنی و میر قەوام رازی و موحەممەد رەفیع پیرزادە.

هەروەها لەنێو قوتابییەکانی میرفندرسکیی کە هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئەفکاری مامۆستاکەی داوە، عەلی قلی کوڕی قرچغای خانە کە بەزمانی فارسیی کتێبێکی گەورەی نووسیوەتەوەو بۆچوونە فەلسەفییەکانی مامۆستاکەی تیادا روونکردووەتەوەو ناوی لێناوە(احیای حکمت)،واتا: (زیندووکردنەوەی دانایی)[1]، هەروەها خوێندکارێکی تریشی کە حسین خونساری(ك١٦٨٦ز)ە، مامۆستایەکی لێهاتوو بووە لەبیرکاری و شێوەناسی و فەلسەفەو فیقهو کەلام و فەرموودە، تائەوەی نازناوی(مامۆستای هەموو شارەزاییەك لەهەموو زانستێکدا)ی پێ دراوە، لەکتێبەکانیشی("رسالة في الجبر والاختيار"، "شرح على الشفاء والإشارات"ی ئیبن سینا، راڤەی(شرح على التجريد)ی نەصیرەدین تووسی، هەروەها راڤەی لەسەر(رسالة في الهيئة)ەی قوشجی.

خونساریی خوێندکاری زۆری هەبوو، لەوانە هەردوو کوڕەکەی کە ناویان جەمالەدین خونساری و رەزی خونساریی بووە، هەروەها مەلا مەسیحا ئەلفسائی(ئەلفسەوی)شیرازی، موحەممەد باقر سیزواریش کە راڤەی هەبووە لەسەر کتێبی "شرح على الشفاء والإشارات"[2]،

---

[1] - ابراهيمي ديناني، غلام حسين، ماجراى فلسفي در جهان إسلام، ج٢، ص٣٢١- ٣٢٢.

[2] - هەمان سەرچاوەو بەش، ل٣٢١- ٣٢٢.

هەروەها میرزا رەفیعا نەلنائینیی کە راڤەیەکی شێوە فەلسەفییانەی هەیە لەسەر(الكافي)[1] کولەینی و راو سەرنجی لەسەر(الإشارات)ی نەصیرەدین تووسی[2].

## صدر المتألهين مەلا صەدرا

صدر المتألهين شیرازی، ناسراو بەمەلا صەدرا(ك١٦٤٠ن)، گرنگترین کەسێتییەکی فەلسەفیی سەردەمی سەفەوییە، کە توانی خوێندنگایەکی فەلسەفیی نوێ بەرانبەر بەدوو خوێندنگا سەرەکییەکەی جیهانی ئیسلامیی دروستبکات، واتا بەرانبەر بەخوێندنگای مەشائی و ئیشراق.

مەلا صەدرا لەدروستکردنی ئەو خوێندنگایەدا پشتی بەستە(العقل البرهاني) و (الكشف العرفاني) و (گواستنەوەی قورئانی)، بەپێی دەربڕینی خۆی، گرنگترین کتێبێکی نووسیبێتییەوە کتێبی(الحكمة المتعالية في الأسفار العقلية الأربعة)یە، کە ناسراوە بەکتێبی(الأسفار) کە تاوەکو ئێستا وەك گرنگترین سەرچاوەیەك دەخوێندرێت لەبواری فەلسەفەو کتێبێ خوێندراوی حەوزە زانستییەکانی شیعە.

---

[1] - ئەلکافی، یەکێکە لەچوار سەرچاوە سەرەکییەکانی فەرموودە لای شیعە.

[2] - کۆربن، هانری، تاريخ فلسفة إسلامي، ص٤٨٠- ٤٨١.

صەدرەدین موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی قومیی شیرازی لەساڵی(١٥٧١ز)لەشیراز لەدایکبووە لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەندو گەورە،بنەماڵەکەی خاوەن دەسەڵاتێکی سیاسی و ئابووریی بوون، باوکی بۆ ماوەیەکی زۆر سەرۆك وەزیران بوو[1]، لەماڵی باوکیدا بەڕێزو بەناز گەورە بوو، باوکی بۆ زانست وەرگرتن هانی دەدا، لەشیرازدا سەرقاڵی خوێندن بوو، کە باوکی مرد ڕۆیشتە ئەسفەهانی پایتەختی دەوڵەتی سەفەوی و لەگەیشتنی بەئەسفەهان یەکسەر ئامادەی وانەکەی بەهائەدین ئەلعامیلیی ناسراو بەشێخ ئەلبەهائیی بوو، کە وانەی مادده گەورەکانی دەوتەوەو کەسە ئاست باڵاکان ئامادەی وانەکانی دەبوون و دوای ئەوەش دابڕا بۆ وانەکانی میرداماد گەورە فەیلەسوفی سەردەمی خۆی[2].

دەکرێ ژیانی زانستیی مەلا صەدرا بۆ سێ قۆناغ دابەش بکەین:

**یەکەم: قۆناغی زانستخوازی:** قۆناغی خوێندنە لەشیرازو ئەسفەهان و قۆناغی گەڕان و بەدواداچوونی بۆچوونی موتەکەلیمین و فەیلەسوفان و گفتوگۆکردنیان و پەشیمانیی کێشا لەوەی تەمەنی لەدەستچوو لەگەڕان و هەڵهێنجاندنی لێکۆڵینەوەی موتەکەلیم و فەیلەسوفەکان کاتێك بەقۆناغی پێگەیشتنی بیریی گەیشت، بەڵام

---

[1] – نصر، حسین، سنت عقلاني إسلامي در إيران، ص٤٠٣.

[2] – صدر الدين الشيرازي، محمد بن إبراهيم، الحكمة المتعالية، محمد رضا المظفر، ج١، ص(ج) و (د).

لەگەڵ ئەوەشدا سوودێکی گەورەی لەو قۆناغە کرد، وەهاش دەردەکەێ کە ئەو رۆژانە رێڕەوە عیرفانییەکەی پێ نەگەیشتبوو.

**دووەم: قۆناغی گۆشەگیری و دابڕان بۆ پەرستش:** مەلا صەدرا لەیەکێك لەدێهاتە دوورە دەستەکانی قوم دابڕا کە پێیدەوترا دێی(کهك) و دابڕا بۆر پەرستش و وەرزشی روحی، چونکە باوەڕی وەهابوو کە رێگەی راستی دەستخستی زانستەکان، راهێنانی دەروون و ئامادەکردنێتی بۆ مەعریفە وەرگرتن و تێگەیشتنی، هۆیەکی تریش وەهای لێکرد دابڕێ، ئەو فشارانە بوو کە لەلایەن شەرعناسە هەوالگێرەرەوەکان و خەڵکانی ترەوە رووبەڕووی دەبووەوە بەهۆی هەندێ لەو بۆچوونە فەلسەفیانەیەوە کە دادی زۆرێکی نەدەداو بەوە گەیشت بەبێباوەڕی بزانن.

**سێیەم: قۆناغی نووسینەوەو دانانی کتێب:** دوای قۆناغی پێگەیشتنی زانستی و ئەزموونی روحی، مەلا صەدرا دەستی دایە نووسینەوەی گرنگترینی نێو کتێبەکانی، ئەویش(الأسفار الأربعة) بوو، کە توانی لەو کتێبەدا خوێندنگەیەکی نوێی فەلسەفیی دابمەزرێنێ کە دەناسرێ بەخوێندنگەی(الحكمة المتعالية)[1].

---

[1] – هەمان سەرچاوە، لا(د) و (ن).

پێویسـتـه لێـرەدا ئامــاژە بدەمــە وشــەی(الأسـفار)، هەنـدێ نمونـەی(کۆنت دوغـابینو) کـە لەسـەدەی نۆزدەدا سـەردانی ئێرانـی کردووە، وەهای گومان کردووە کە (الأسفار)کۆی(سفر)،واتا"گەشـت و گەڕان"و بەوەش وەهای گومان بردووە کە مەلا صـەدرا بەوڵاتانـدا گەڕاوە، بـەڵام هەنـدێکی تـری نمونـەی(ئای. بـراون) وەهـای گومـان کـردووە کـە(الأسـفار)کۆی(سـفر)ە، واتا"کتێـب"، بـەوەش وەهـای داناوە(الأسفار الأربعة)واتا چوار کتێب، بەڵام لەڕاستیدا (أسـفار) کـە کۆی (سفر)ە واتا گەشت و گـەڕان، مەبەسـت بەگـەڕانی ماددییانـەی نێـوان وڵاتــان نییــە، بــەڵکو گــەڕانی مەعنــەوی و عیرفانییــە، بۆیــە زاراوەی(الأسفار الأربعـة) زاراوەیـەکی عیرفانییـە بـەلای عاریفانـەوە، خـــودی مـــەلا صـــەدراش لەپێشـــەکی کتێبەکەیـــدا ئامـــاژەی بە(الأسفار)داوەو ئەڵێ:"بزانـە بـۆ ڕێبـواران لـە عـاریف و ئـەولیاکان چوار گەشت هەیە، گەشتێك لەخەڵقەوە بۆ حەق، دووەمیش گەشـتی حەق لەحەقەوە(واتا دوای ئەو ڕێبوارەکە بەبوونی حـەقانی دەگـات، لەو حەقـەوە گەشـت دەکـات بـۆ ناسـینی تـەواوی ناوەکـانی خـوا)، گەشـتی سـێیەمیش بەرانبـەرە بەیەکـەم، چـونکە لەحەقــەوە بـۆ خەڵقە(گەشتێکە هەموو بوون دەبینێ)، چوارەم بەرانبەرە بەدووەم، لەمەخلوقەوە بۆ مەخلوق بەحەق گەشتیان پێ دەکات(واتا مەقاماتە عیرفانییەکان پێشانی مەخلوقەکانی تر دەدات))[1].

---

[1] – صدر الدين الشيرازي، محمد بن إبراهيم، الحكمة المتعالية في الأسفار العقلية الأربعة،ج١، ص١٢.

بەوە مەلا صەدرا ئەو زاراوە عیرفانییەی کردووەتە ناونیشانی کتێبەکەی و بەچوار بەش ڕێکیخستووە، بەلاّم لەبەرئەوەی کتێبی(الأسفار) کتێبێکی فەلسەفییە نەك عیرفانی، ئەوە وشەی(العقلية)ی خستووەتە پاڵ(الأسفار) تاوەکو لەگەڵ ئەسفاری عیرفانیدا تێکەڵ نەبێ و کتێبەکەی ناوناوە(الحكمة المتعالية في الأسفار العقلية الأربعة)[1].

دوای ساڵانێکی دابڕان کە مەلا صەدرا لەدێی(کهك) بەسەری برد و گرنگترین کتێبکێکی تێدا نووسییەوە، فەرمانڕەوای شیراز(الله ویردی خان) نامەی بۆ ناردو بانگهێشتی کرد سەرۆکایەتیی خوێندنگای خان بکات کە دروستیکردبوو، ئەویش داواکەی قبوڵکرد، بنەی پێچایەوەو گەڕایەوە شیرازی شوێنی لەدایکبوونی، چەند ساڵێکی تیادا بەسەربردو سەرقاڵی لێکۆڵینەوەو وانەوتنەوەو نووسینەوەی کتێب بوو، خوێندنگای خانی کردە سەنتەری وتنەوەی زانستە عەقڵییەکان لەئێراندا، زۆرێك فەیلەسوف لەسەر دەستی ئەو پێگەیشتن، کە گرنگترینیان باس دەکەین:

**مەلا موحسینی ئەلفەیضی ئەلکاشانی:** خاوەن دانراو گەلێکی زۆرە، لەوانە: (الوافي) لەفەرموودەو (الصافي) لەتەفسیرو (المحجة البيضاء) لەئەخلاق و عیرفان و (أصول المعارف) لەفەلسەفەو عەقائید، دیوانە شیعرێکیشی هەیە کە دەربڕینی بۆچوونە عیرفانی و

[1] – نصر، حسين، سنت عقلاني إسلامي در إيران، ص٤٠٧.

ئەزموونە رووحانییەکانێتی، بەزمانی فارسی نووسیویێتی و شێوازی حافیزی شیرازیی پەیڕەو کردووە، حافیزی شیرازیی شاعیری بەناوبانگی عیرفان.

**مەلا عەبدولڕەزاق لاهیجی:** کتێبی فەلسەفی و کەلامیی زۆری هەیە، شێوازی زاڵی سەر نووسینەکانی قسەی فەلسەفییە،گرنگترین کتێبەکانیشی ئەمەیە: (شوارق الألهام في شرح تجريد الكلام) و (حاشية على شرح الإشارات)ی تووسی و کتێبی(کوهر مراد)واتا: گەوهەری مورادو بەفارسیی نووسیویێتی، راڤەی نامەی(هياكل النور)ی سوهرەوەردی کە بەڵگەی ئامازەکانی ئەوە بەفەلسەفەی ئیشراق، شاعیر بووەو دیوانە شیعرێکی بەزمانی فارسیی هەیە.

**مەلا حوسێنی ئەلتنکابنی:** پەراوێز(حاشية)ەی هەیە لەسەر کتێبی(الشفاء) و لەسەر(حاشية الخفري على التجريد).

**موحەممەدی کوڕی عەلیی رەزای کوڕی ئاغاجانی(آقاجاني):** راڤەی هەیە لەسەر کتێبی(القبسات)ی میرداماد[1].

مەلا صەدرا زاهیدێکی خواپەرست بوو رووی لەدونیا وەرگێڕابوو، حەوت جار حەجی ماڵی خوای کردبوو، بەزۆریی بەپێ حەجی

---

[1] خامنهاي محمد: حكمت در إيران و جهان، ص٢٧٧، ٢٧٩.

کردبوو، لەحەوتەمین حەجدا لەگەڕانەوەی لەمەککەوە بۆ ئێران لەساڵی(١٦٤٠ز) لەبەسرەدا مردو لەوێدا نێژرا.

## خوێندنگای(الحكمة المتعالية)

مەلا صەدرا بەجیاواز لەهەردوو خوێندنگای سەرەکیی مەشائی و ئیشراق لەپرۆگرامەدا خوێندنگایەکی نوێی فەلسەفیی دامەزراند، خوێندنگای مەشائیی وەك تاکە بناغەی وەرگرتنی مەعریفە پشتی دەبەستە عەقڵ، بەڵام خوێندنگای ئیشراق گەڕانی عیرفانی و کەشفیی کردبووە بناغەو گەڕان و لێکۆڵینەوەی بەڵگەیی(برهانی) کردبووە پاشکۆی عیرفانی، بەڵام مەلا صەدرا پشتی بەستە هەموو سەرچاوەکانی مەعریفە، ئەویش: بورهان و عیرفان و قورئان بوو، هەوڵیدا لەڕێی بینین و کەشفی ئیلاهییەوە حەقیقەتە ئیلاهییەکان بسەلمێنێ، بەبەڵگەی عەقڵی بورهانییش بەڵگەی لەسەر بدات و بەئایەتی قورئانی و فەرموودەی پیرۆزیش پشتگیریی ئەو حەقیقەتانە بکات[1].

باوەڕی بەهاوچەشنێکی تەواوی نێوان ئەو سێ ڕێگەیە هەبوو بۆ مەعریفە، بەتایبەت باوەڕی هەبوو بەبوونی گونجانێکی تەواوی نێوان عەقڵ و شەرع، ئەڵێ:"حاشا ئەگەر ئەحکامەکانی شەریعەتی حەق و

---

[1] - جوادی آملی، رحیق مختوم، ج١، ص١٦– ١٩.

ڕۆشنی ئیلاهیی دژ بێ بەمەعریفە پێویستەکانی یەقین، لەنێوبچێ فەلسەفەیەك یاساکانی لەگەڵ قورئان و سووننەتدا نەگونجێن"[1].

بەو شێوەیە مەلا صەدرا، توانی خوێندنگایەکی فەلسەفیی جۆر جیاواز دابهێنێ، بەڵام کاتێك ئەم خوێندنگایە بەوانەی پێش خۆی بەراورد دەکەین، دەبینین خوێندنگاکەی صەدرا لەسەر بنەمای کۆکردنەوەی بۆچوونە جیاوازەکانی هەردوو خوێندنگای مەشائی و ئیشراق دەوەستێتەوە لەفەلسەفەو خوێندنگای ئەشعەری و ئیعتیزال لەکەلامدا، هەروەها قوتابخانەی ئیبن ئەلعەرەبیی لەعیرفانی تیۆری.

لەڕاستیدا کۆمەڵێ بابەتی وەرگیراوی قوتابخانە هەمەجۆرەکانی فەلسەفەو کەلام و عیرفانە، تائەوەی هەندێ کات زۆرێك لاپەڕەی(إحياء علوم الدين)ی غەزالی و (المطالب العالية)ی فەخری رازی و (الفتوحات المكية)ی ئیبن ئەلعەرەبیی و کتێب گەلێکی ئەگوازێتەوە،ئەوەیە هەندێ فەیلەسوفی مەشائیی لەدژ تووڕە کردووە وەك(الحكيم جلوه) کە رەخنەی لەمەلا صەدرا گرتووەو تۆمەتی دزیی ئەدەبیی ئاراستە کردووە.

سەرەڕای ئەوە، ئەوە خوێنەری کتێبەکانی مەلا صەدرا ناتوانێ چاو لابدات لەسەر شێوازە جوان و داهێنانەکەی لەکۆکردنەوەی بۆچوونەکان و هەندێ جارێکیش خستنەڕووی بۆچوونێکی جوان و داهێنراوانە، داهێنانی مەلا صەدرا تەنیا لەپرۆگرامدا کورت

---

[1] – صدر الدين الشيرازي، محمد بن إبراهيم، الحكمة المتعالية في الأسفار العقلية الأربعة،ج٨، ص٣٠٣.

نەهاتووەتەوە، بەڵکو تێپەڕیووە بۆ هەوڵی سەلماندنی زۆرێك بیری ئاینی و عیرفانی بەبەڵگەی عەقڵی، ئەوەش دوای ئەوەی فەیلەسوف و عاریفەکان دەستەوەسان مانەوە لەسەلماندنی، وەك بابەتی قیامەت و حەشر بەلاشەوە کە ئیبن سینا بێ توانا بوو لەسەلماندنی و هەر بەڵگەی گوازرەوە(النقل) لەبەردەستدا هەبوو، بەڵام مەلا صەدرا توانی بەڵگەی عەقڵیشیی لەسەر بهێنێتەوە[1].

بیری مەلا صەدرا لەبیری فەلسەفیی ئێراندا بازدانێکی هێنایە ئاراوە، فەلسەفەکەی خۆی سەپاندە سەر ژیانی عەقڵیی لەئێرانی ئەو سەردەمەدا، واتا دەورووبەری چوار سەدە[2]، ئەمەی خوارەوەش لیستێکە سەبارەت بەگرنگترین ئەو داهێنانە فەلسەفییانەی کە مەلا صەدرا زیادی کرد:

١- سەلماندنی بنەچەی بوون و ئیعتیبارە چییەتییەکەی.

٢- گومانکردن لەبوون.

٣- هێنانەوەی بەڵگەیەکی نوێ لەسەر یەکبوونی بوون(وحدة الوجود).

٤- هێنانەوەی راڤەیەکی نوێ بۆ پەیوەندیی نێوان(العلة) و (المعلول) لەسەر بنەمای بوونی پێکەوە گرێدەر.

---

[1] - آشتياني، جلال الدين، شرح حال وآراى فلسفى ملا صدرا، ص١٩-٢٩.

[2] - صدر الدين الشيرازي، محمد ب إبراهيم، الشواهد الربوبية، مقدمة جلال الدين الأشتياني، ص٦٠.

٥- سەلماندنێکی نوێی ئیمکان(بوون و نەبوونی مەخلوقات) و وجوب(هەبوونی خوا بەهەمیشەیی).

٦- سەلماندنێکی نوێی بەڵگەی(برهان الصدیقین- راستگۆیان)، سەلماندنی بوونی خوا لەخودی خۆیەوە جیاواز لەبەڵگەکانی تر.

٧- تیۆری سادەی حەقیقەت هەموو شتەکانە.

٨- چارەسەرکردنی کێشەی زانست و زانینی پێویست بەشتەکان لەپێش بوونیان، بەو ئیعتیبارەی زانینیان زانین و زانستێکی وردو تەواوی هەموو شتێکە کە لەداهاتوودا دروست دەبن.

٩- تیۆری جووڵەی جەوهەریی.

١٠- تیۆری یەککگرتنی (العاقل و المعقول).

١١- تیۆری ئەوەی دەروون لەڕووی جەستەوە دروست بووە(حدوث)و لەڕووی روحیشەوە هەمیشەییە.

١٢- تیۆری ئەوەی دەروون لەتاکێتیی خۆیدا هەموو هێزەکانە(هێزەکانی هەست و ئیدراک).

١٣- هێنانەوەی بەڵگەی عەقڵیی لەسەر قیامەت و حەشر بەلاشەوە.

١٤- خستنەبەرباس و چارەسەرکردنی بوونی زیهنی لەڕێگەی جیاوازیکردنی نێوان بوونی واقیعی و باو.

١٥- زیادکردنی یەکەو یەکبوونی باو بۆ پاڵ یەکینەکانی هەشت رەگەزە دژەکە.

١٦- قووڵکردنەوەی لێکۆڵینەوەی چەمکە چییەتی و فەلسەفی و لۆژیکییەکان[١].

## کۆتایی

ماوەی سەفەوییەت لەبواری تەصەوفدا، بزووتنەوەی سۆفیگەریی لەئێراندا بەلوتکە گەیاند، هەروەك بنەماڵەی سەفەوییەتیش لەسەر شانی تەریقەتە سۆفیگەرییەکان خۆی دامەزراند، بەلأم دوای سەقامگیربوونی دەسەلأت و دەرکەوتنی ناکۆکیی لەنێوان تەریقە سۆفییەکان و سوڵتانە سەفەوییەکان لەلایەك و لەنێوان سۆفی و شەرعناسەکانیش لەلایەکی ترەوە، تەریقەتە سۆفییەکان تووشی لێدان گەلێکی توونـدو سەخت هاتنەوە، ئەوەش وەهایکرد لەکۆمەڵگەی ئێراندا رۆڵیان بەتەواوی گەمارۆ بیێ و لەبەرانبەردا رۆڵی شەرعناسان بەهێزبێتەوە.

هەروەها لەبواری فەلسەفیشدا، ئەو ماوەیە هەوڵ گەلێکی گرنگی بەخۆوە بینی لەبەکارهێنانی وتەو قسەی فەلسەفیانە لەڕاڤەو روونکردنەوەی بیروباوەڕە لاهوتییەکان و بەتایبەت بیروباوەڕە شیعەییەکان، کە دەتوانین ئەو ماوەیە بەقۆناغی دامەزراندنی لاهوتی شیعەی ئێران بزانین، کە ئێرانییەکان لەتەصەوفەوە- کە بەخۆی هۆیەك بوو لەهۆکارەکانی گۆڕینی مەزهەبی ئێرانییەکان لەسوونەوە

---

[١] - هەمان سەرچاوە، هەروەها بڕوانە: نصر، حسین، سنت عقلاني إسلامی در إیران، ص٤١١، ٤٢٥.

بـۆ شـیعە- گـۆڕان بـۆ خیتـابی فیقهـی و دامـەزراوەی فیقهیـی شیعەییانەو زۆرێك بیری کەلامی و فەلسەفیی مەزهەبە جیاوازەکانیان کۆکردەوەو روانگەیـەکی عیرفانیانـەیان پـێ دا و وەك پاڵپشـتییەکی دونیا بینیی شیعە بەکاریانهێنا.

# زانست و هونەرو ویژەکان لەسەردەمی سەفەوییەتدا

"فاتیمە ئەلهاشمی* "

سەردەمی سەفەوییەت، بەماوە گرنگەکانی مێژووی ئێران دادەنرێت، ئەو گرنگییەش بەهۆی پتەوکردنی ئەو بنەما زانستی و ژیارییەوە بووە کە ئێران لەو سەردەمەدا پێیدا تێپەڕ بووەو پەرەسەندن و پێشکەوتن گەلێکی زۆری بەخۆوە بینیووەو لەهەموو بوارەکاندا کتێبی نوێ دەرکەوتووە، لەوانە: دانراوی فەلسەفی و عیرفانی و وێژەیی و فیقهی، لەزانستە سرووشتییەکانیش نمونەی بیرکاری و فەلەکی و پزیشکی، ئەو پێشکەوتنانەش ئاماژەو هێمای پێکهێنانی جووڵەیەکی نوێ بوون، بەدەربڕینێکی تر، ئەو سەردەمە هەموو پێداویستییەکانی بوونیاتنانی شارستانییەتی لەخۆی هەڵگرتبوو.

---

* – لێکۆڵەرێکی ئێرانیی بنەچە عێراقییە.

گرنگترین لایەنە ژیارییەکانی سەردەمی سەفەوییەت، بڵاوبوونەوەی زانست و قوتابخانەو هونەرەکان بوون، دەوڵەتی سەفەوییەت بووە نمونەی دەم و ماوەی ئاڵتوونیی مرۆڤی ئێرانی، مرۆڤی ئێرانیی خۆزگەی گەڕانەوەی دەخواست، سیاسییە ئێرانییەکانیش بەرنامەڕێژیی بۆ دەکەن و ئومێد دەکەن بگەنە لوتکەی گەشەی سەدەی پانزەیان، جا بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر رۆڵی سەفەوییەکان دەوەستێ لەپاڵدانی کاروانی گەشانەوەی تەواوی بوارەکان، لەوانەش بوارەکانی زانست و هونەرەکان.

**یەکەم: زانستە ئایینییەکان**

سەرەتای سەدەی پانزە، شانۆی رەوتە فیکرییە جۆرەبەجۆرەکان بوو، هەندێك سەرقاڵی زانستە سرووشتییەکانی وەك ئەستێرەناسی و بیرکاری و پزیشکیی بوون کە پێوەری ئەو زانستانە ئەزموونە، هەندێکی تریش سەرقاڵی حیکمەت و عیرفان و مەعریفە عەقڵییەکان بوون کە تەنیا بەپێوەری عەقڵ دەرك دەکرێن، هەندێکی تریش سەرقاڵی زانستی شەرعیی بوون نمونەی فیقهو ئسوڵ و فەرموودەو تەفسیر، جا لەنێو ئەو کەشو هەواو ژینگە بارگاوییەدا قوتابخانەی هەواڵگێڕانەوە(إخباری) هات کە بەپێنووسێکی پان و گەورە خەتی هێنا بەسەر زانستە عەقڵییەکانداو

لەزانستە عەقڵی و نەقڵییەکاندا هیچ نرخ و کێشێکی بۆ عەقڵ دانەنا، ئاڵاهەڵگری ئەم قوتابخانەیە شێخ موحەممەد ئەمینی کوڕی موحەممەد شەریف ئسترابادیی ئیخبارییی بوو لەکتێبەکەیدا(الفوائد المدنیة) کە لەڕۆژگاری مانەوەی لەمەدینەدا ئەو کتێبەی نووسییەوەو بیرۆکەکەی لەمانەی خوارەوەدا کورت دەبێتەوە:

١- ڕواڵەتەکانی قورئان نابنە بەڵگە تەنیا دوای هێنانەوەی تەفسیر نەبێ لەئەهلی بەیتەوە(خوایان لێ ڕازیی بێ)، چونکە فەرموودەی نەهیی هاتووە لەتەفسیرکردنی قورئان بەبۆچوون، ئینجا دەرکەوتنی باس و حوکمی تایبەت و پەیوەست بەڕووی گشتییەکاندا.

٢- ڕەتکردنەوەی بەڵگەبوونی بڕیاری عەقڵ و هاوپەیوەستییەکیش لەنێوان بڕیاری عەقڵ و نەقڵدا نییە.

٣- ڕەتکردنەوەی بەڵگەی کۆدەنگی و بەڵگەی ئسوڵی و فیقهییەکانی تر تەنها بەڵگەی هەواڵ و گێڕانەوەکان نەبێ[1].

ئەم بزووتنەوەیە کاریگەریی کردە سەر تەواوی زانستە ئایینییەکانی ئەوکات و ڕێرەوی گۆڕی و هەواڵ و گێڕانەوەکانی وەك سەرچاوە بەسەر زانستە ئایینییەکاندا سەپاندو لەهەموو بوارەکاندا وریایی کرد لەپێچەوانەکردنی.

---

[1] - بۆ زیاتر شارەزابوون، بڕوانە: تاریخ الفقه الإسلامي وأدواره، جعفر سبحاني، ص٣٨٤، ٣٨٥.

أ- فەلسەفەو لاهوت:

فەلسەفەو دانایی لەسەردەمی سەفەویدا گەشەیەکی روونی وەرگرت، دوای وردبوونەوەو رامان لەدەقە عەقلّییەکان و دانایی ئەو دەمەدا، ئەکریّ بەوە بگەین و پوخت بکەینەوە کە پەیوەندیی نێوان فەلسەفەو عیرفان و کەلام لەلایەك و هەولّی نزیکخستنەوەی نێوان عەقلّی فەلسەفی و دەقە شەرعییەکان لەلایەکی ترەوە، فەلسەفەیەکی دامەزراند بەتایبەت لەئەسفەهاندا ناسرا بەقوتابخانەی فەلسەفیی ئیلاهی، لەسەر ئەو بنەمایەش(الحکمة المتعالیة)ی مەلا صەدرا دامەزرا، مەلا صەدرا بیروباوەڕی شیعەی تێکەلّ بەبیری فەلسەفیی کردو پێشەوایەتیی سیستەمێکی بیریی تەواوی کرد بۆ پالّپشتیی کردنی گەشەی هەلّچووی شیعەی ئەوکات لەئێراندا، دیارترین دانراوەکانی مەلا صەدرا کتێبی(الأسفار الأربعة) بوو، گرنگترین بابەتە نوێیەکانی فەلسەفەی صەدرائییەش بناغەو بنەچەی بوون و یەکگرتنی عەقلّ و مەعقولّ و جوولّەی جەوهەریی بوو.[1]

لەئەنجامە گرنگەکانی دیکەی بزووتنەوەی فەلسەفەی ئەو سەردەمە، دەرکەوتنی دانا"میرفندرسکی"بوو کە دانایەکی مەشائیی

---

[1] - مقتبسات من آثار الفلسفة الإلهية في إيران، سيد جلال الدين آشتياني، جامعة فردوسي، مشهد، ١٣٥٥هـ/ ١٩٣٦م، المجلد الأول، ص٦٣.

بـوو، بـاوەڕی بەشـێوازی بیرکردنـەوەو رامـان بـوو لەفەلسـەفە[١]، هەروەها "میرداماد"ی ناسراو لـەئێران بەمامۆسـتای سـێیەم لـەدوای ئەرسـتۆو فـارابی، بناغـەی فەلسـەفەی لای میردامـاد پێکهـاتبوو لەپێکەوەنووسـانێکی گونجـاو و رێکخـراوی نێـوان بـیری بورهـانی و دۆخـی عیرفـانی، فەلسەفەکەشـی بەفەلسـەفەی عیرفـانیی ناسـرا، چونکە بەڕێوە رۆیشتنی عەقڵ و بیر(زیهن) رێگـە پیشـان دەدەن بـۆ ئامـاژەکانی دڵ و بەرچاو روونییە روحانییەکان.

ئەگـەر بـەوردی و رامانـەوە بڕوانینـە فەلسـەفەی ئـەو دەمـە مێژووییە، دەبینین کە پێویستە سەردەمی سەفەوییەت بەسـەردەمی نوێکردنـەوەی ژیـانی فەلسـەفەی ئیسـلامیی ناوببرێـت، کـە پێشـتر بـەهۆی زاڵبـوونی بـیری ئەشـعەرییەتی دژە فەلسـەفەوە بـیری فەلسەفیی لەوڵاتانی ئیسلامیدا داڕوخابوو[٢].

هـەروەها لـەبواری زانسـتی کەلامیشـدا هـەوڵ گـەلێکی زۆر دەرکەوت، بەتایبەت لەبەشە شیعەییەکان، لەوانە بابەتی ئیمامـەت و راڤـەی هەنـدێ کتـێبی کـەلامیی قوتابخانـە شـیعەکان، وەك تجریـد الاعتقـادی خواجـە تووسـی کـە هەنـدێ زانـای سـەفەوییەت راڤـەیان کرد[٣]، بەڵام فەلسەفەی ئەو ماوەیە لەزانستی کەلام جیا نـەبوو، ئـەو

---

[١] – هەمان سەرچاوە، لا٧١، ٧٢.

[٢] - پێشەکیی(توشیکیهونەیزوتسو) لەسەر کتێبی(قبسات)ی میرداماد، لا١٠٩.

[٣] - بۆ زیاتر شارەزابوون، بڕوانە: صفوية از ظهور تا زوال(الصفوية من الظهور إلى الزوال)، رسول جعفريان، ص١١٥.

دەمە مێژووییە ماوەی لوتکەی گەشەی کەلامی فەلسەفیی بوو، فەلسەفە بەکاردەهێنرا بۆ روونکردنەوەو سەلماندنی بیروباوەڕە کەلامییەکان، بەوەش شیعەگەریی توانی لەکۆشەگیریی رزگاری ببێ و زۆرێك خەڵکی غەیرە شیعە بۆ خۆی رابکێشێ و بەبێ پێویست بوون بەبەکارهێنانی توندوتیژیی و هێز بیروباوەڕی شیعەیان بەسەردا بسەپێنێ.

## ب- عیرفان و تەصەوف

عیرفان دیاردەیەکی گرنگ و پانوپۆڕە لەمێژووی رۆشنبیریی ئێراندا، لەدەقە عیرفانییەکانی ئەو سەردەمەدا کە ماوەتەوە دەبینین، سەردەمی سەفەوییەت سەردەمی دەرکەوتنی گرووپە زۆرەکانی شیعەیە، بۆیە ناکرێ عیرفانی ئەو سەردەمە بەعیرفانی پێش داگیرکاریی مەغۆل لەسەدەی حەوتی کۆچیی بەراورد بکەین، پاشان لایەنی عیرفانی و زەوقیی لەبەشی(وحدة الوجود) و بینین(شهود) و یەکگرتن و فەنابوون و هاوشێوەکانی تری لەکەسێتیی گەلێکی عیرفانی و داناییدا دەبینین، نمونەی شێخی بەهائی و میردامادو میرفندرسکی و مەلا صەدراو مەلا موحسینی فەیزو هاوشێوەکانیان، بیری ئەوانەش گوازرایەوە بۆ کەسێتی گەلێکی عیرفانیی گرنگ کە تاوەکو ئێستا کایگەریی زۆریان هەیە لەگۆڕەپانی رۆشنبیریی ئێراندا، لەوانە سوهرەوەردی و ئیبن

ئەلعـەرەبی و عەبـدولڕەزاق ئەلکاشـانی و ئەلقەیســەری و هــەروەها پێشەوا غەزالیش.

ئــەوەی عیرفــانی تیــۆریی ئــەو ماوەیــە لــەماوەی پێشــتر جیــا دەکاتــەوە، ئەوەیــە کــە زانســتەکانی عیرفــان و فەلســەفەو دەقــە ئایینییە شیعەییەکان لەسیسـتەمێکی گونجـاودا تێکـەڵکران و بوونـە پێکهاتەی یەك کۆمەڵەی تەواو[1].

گرنگترین نمونەیەکی ئەو ئاوێتەکردن و تێکەڵکردنە، کتێبی(محجة البیضـاء) مـەلا فـەیضـی کاشـانییە، کـە لەحەقیقەتـدا دووبـارە داڕێژانەوەی کتێبی(إحیـاء علـوم الـدین)ی غەزالییـە، بـیری سـوونە مەزهەبی لێ داماڵیوەو گونجاوی کردووە بەبیروباوەڕو گێڕانـەوەکانی شیعە، فەیض لەو کتێبەدا گێڕانەوەو بیروباوەڕی سوونەی پێچەوانە بەشـیعەی سـڕیووەتەوەو گێڕانـەوەو بیروبـاوەڕی شـیعەی بـۆ زیـاد کردووە.

نمونەیـەکی دیکـەی گـرنگ، سـەید حەیـدەر ئاملییـە(ك٧٩٤ك/١٣٩١ز)، ئەگەرچـی لەسـەردەمی سـەفەوییەتدا نـەژیا، بـەلاّم لێـی نزیکبوو، بەیـەکێك لـەگرنگترین پێکهێنـەرە سـەرەکییەکانی ژینگـەی سـەفەوییەت دادەنرێـت، تـوانی بـیری ئـیبن ئەلعـەرەبیی عـاریفی بـەناوبانگی سـوونە بخاتـە خزمـەت بیروبـاوەڕە شـیعەییەکانەوەو

---

[1] - پێشەکیی(توشیکیهونەیزوتسو) لەسەر کتێبی(قبسات)ی میرداماد، ل١٠٩٧.

خوێندنەوەیەکی شیعەییانەی پێشکەشکرد لەبارەی کولتوری عیرفانیی گەشەسەندووی ئەوکاتی ئێرانەوە.

### ج- فیقهو زانستە شەرعییەکان

سەدەی دەو سەرەتای سەدەی یانزەی کۆچی، تایبەتمەند بوو بەزۆریی بەرهەمی فیقهی و زۆریی شەرعناسان، چونکە لەسەرەتای سەدەی دەی کۆچی(٩٠٥ك/ ١٤٩٩ز) لەسەردەستی شا ئیسماعیلی سەفەوی، دەوڵەتێکی شیعە دامەزرا، دەوڵەتێك بوو پێویستییەکی زۆری هەبوو بەدەستورو یاسا گەلێکی شەرعییانەی گونجاو لەگەڵ مەزهەبی فەرمیی دەوڵەتەکە، ئێمەش لێرەدا دەستهاتی ئەو هەوڵانە دەخەینەڕوو کە لەو سەدەیەدا هاتە بەرهەم:

١- دەرکەوتنی کتێب و دانراو گەلێك لەبواری فیقهی حکومییدا سەبارەت بەخەراج و نوێژی هەینی و شتانی تر، ئەمەش پێشینەیەك بوو لەمەزهەبی شیعەدا پێشتر نمونەی وەها نەبینرابوو، چونکە شیعە لەپێش دەوڵەتی سەفەوییەت مەزهەبی فەرمیی وڵات نەبوو، زانا شیعەکانیش یەکدەنگ بوون لەسەر حەرامبوونی دامەزراندنی حکومەت لەسەردەمێکدا ئیمامی دوانزەیەمین دیار نەبووبێت.

٢- دەرکەوتنی مەوسوعەیەکی گەورەی فیقهی کە تەواوی لێکۆڵینەوەو بەشە فیقهییەکانی بەپێی روانگەی مەزهەبی شیعە لەخۆگرتبێ، دیارترین ئەو کتێبانەش"جامع المقاصد"ی شێخ عەلیی

ئەلکەرکییە لەسیانزە بەرگدا، "مجمع الفائدة والبرهان"ی ئەلمەقدیس ئەلئەردەبیلییە لەچواردە بەرگدا، (الحدائق الناضرة)ی شێخ یوسف ئەلبەحرانییە لەبیست و پێنج بەرگدا،ئەوەش ئاماژە دەداتە ئەوپەڕی پێویست بوون بەفیقهێکی شیعە مەزهەبانە لە کۆمەڵگەیەکدا کە دەوڵەتێکی شیعەی تازە لاو فەرمانڕەوایی دەکات و ئەیەوێ یاساکانی شەریعەت جێبەجێی بکات، کە لەماوەیەکی رێژە کورتدا مەوسوعە گەلێکی گەورە دەرکەوتن.

٣- گرنگیدانێکی زۆر بەتێگەیشتن لەقورئان، بۆیە لەو سەدەیەدا زۆرێک کتێب لەبارەی ئایەتەکانی ئەحکامەوە نووسرانەوە.

٤- گرنگیدانی زۆر بەپێشەکییەکانی پیاوناسی و راستکردنەوەی ئیسنادەکان و زانستی تێگەیشتنی فەرموودەو کۆکردنەوەی گێڕانەوە شیعەییەکان.

## د- فەرموودەو گێڕانەوە شیعەییەکان

زاناو فەرموودەناسە شیعەکان خزمەتی گرنگیان بەفەرموودە کرد، بەسوود وەرگرتن لەو دۆخەی کە دەسەلاتیفەرمانڕەواو بیری نوێی هەوالگێران رەخساندیان، جا ئەو سەردەمە بە دوو شت تایبەتمەندە: کۆکردنەوەی فەرموودە نووسراوەکان و کۆکردنەوەی گێڕانەوە تەفسیرییەکان.

هـــەروەك هـــەوڵ گـــەلێكی زۆر درا لەكۆكردنـــەوەی ئـــەو كتێبـــە فەرموودەییانـــەی كـــە لەپـــەڕەو كتێبـــە قـــەبارە بچـــووكەكاندا لـــەنێو لاپەڕە گەلێكی زۆردا پەرش و بڵاوبوون و جارێ نەفەوتابوون، روونـە كـە لەنێوچـوونی كتـێبی قـەبارە بچـووك ئەگـەری زۆرتـرە لـەكتێبی قـەبارە گـەورەی دە بەشـی، بۆیـە كـۆكراوە فەرموودەییـە هەمـە شێوازەكان بەشێوازێكی تایبـەت رێكخـران، ئێمـەش ئـەو فـەرموودە كـۆكراوو نووسـراوانەی ئـەو سـەردەمە بـەم شـێوەیەی خـوارەوە ئەناسێنین:

**یەكـەم: الـوافي:** دانـراوی مـەلا موحەممـەد موحسـین ناسـراو بەئەلفـەیضـی كاشـانییە(ك١٠٩١ك/ ١٦٨٠ز)گێڕانـەوەی چـوار كتێبـە شـیعەكەی تیـادا كۆكردووەتـەوە(الكـافي، مـن لا یحضـره الفقیـه، الاستبصار، التهذیب)، بەپێی ئەوەی شتی دووبـارەی سـڕیووەتەوەو دانـەر هەنـدێ شـتی پێویسـتی روون كردووەتـەوە، ئـەوە ئـەو كۆمەڵەیـەی لەچـوارده تـەوەردا كۆكردووەتـەوە، لـەگرنگترین ناونیشانەكانیشـی: كتاب(العقـل والعلـم والتوحیـد)، كتـاب(الحجـة)، كتاب(الإیمان والكفر)، كتاب(الطهارة والتزیین)، كتاب(الصلاة والـدعاء والقرآن)، كتاب(الزكاة والخمس والمیراث)[1].

---

[1] – دروس في نصوص الحدیث ونهج البلاغة، مهدي المهریزي، ص١٢٦.

**دووەم: وسائل الشیعة:** دانراوی موحەممەدی کوڕی ئەلحەسەن ئەلحوڕی ئەلعامیلی(ك١١٠٤ك/ ١٦٩٢ز) و تیایدا تەنیا گێڕانەوە فیقهییەکانی کۆکردووەتەوەو کۆی گێڕانەوەکانی(٣٥٨٦٨) گێڕانەوەیەو دانەر لەچوار کتێبە فەرموودەییەکەی شیعەوە وەریگرتووە، سەرباری کتێبی دیکەی فەرموودە[1].

ئەم کتێبە لەلێکۆڵینەوە فیقهییەکانی شیعەدا گرنگییەکی زۆری هەیەو هیچ قوتابی و مامۆستایەك لەحەوزە شیعەییەکانی قۆناغە پێشکەوتووەکانی لێکۆڵینەوە فیقهییەکاندا نییە پێویستی پێ نەبێ، هەروەك لەماوەی دواتردا کۆمەڵێ گێڕانەوەی دیکەی بۆ زیاتر کراوە لەنێو کتێبی(مستدرك الوسائل)ی میرزا حوسێن ئەلنوریی کۆچکردووی(١٣٢٠ك) کە(٢٣١٢٩)فەرموودەیەو بەپێی ئەلعامیلیی مۆر کراوەو سوودی زۆری بۆ زیاتر کراوە بەسەرچاوەو روانینی خاوەن الوسائل[2].

**سێیەم: بحار الأنوار:** لەدانراوەکانی موحەممەد باقڕ ئەلمەجلیسییە(ك١١١١ك/ ١٦٩٩ز) و گەورەترین کۆکراوە فەرموودەییەکانی شیعەیەو لەڕووی فراوانی و گشتگیرییەوە نمونەی نەنووسراوەتەوەو بەپێی چاپی نوێ لەسەدو دە بەشدایە و زانیاریی

---

[1] – هەمان سەرچاوە، ل١٢٨.

[2] – هەمان سەرچاوە، ل١٣٨.

گەلێکی هەمەجۆری ئاییینی لەخۆگرتووە لەڕووی عەقائیدو مێژوو ناسینی جیهان و رەوشت و فیقه[١].

ئەلمەجلیسی، کتێبەکەی(بحار الأنوار)ی لەبیست و پێنج بەرگدا نووسیوەتەوە کە ئەمانەی لەخۆگرتووە: العقل والجهل والعلم، التوحيد والأسماء الحسنى، النبوة وقصص الأنبياء، المواعظ والحكم، القرآن والأدعية، العقود والإيقاعات[٢]، ئەو مەوسوعەیە گەورەترین و گرنگترین سەرچاوەیەکی ئاییینی شیعەی ئێرانە، کە دانراوێکی تەواوی بیروباوەڕو ئەحکام و تەفسیرو تەواوی زانستە ئاینییەکانی لەخۆگرتووە بەپێی تێڕوانینی شیعە، هەروەك رەنگدانەوەی ئەو زیاتر کردنانەشە کە لەسەردەمی سەفەوییەتدا خراونەتەسەر شیعە، بەتایبەت مێژووی دانانی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەردەمی سەفەوییەت لەسەردەمی شا حوسێنی سەفەوی، کە ئەفغانەکان رووخاندیان، گرنگترین شتێك لەو کتێبەدا سێ بەرگی گەورەیەتی لەتانەدان لەسێ خەلیفە سەرەتاکەی ئیسلام کە لەچاپەکانی نوێدا سڕاونەتەوە، بەڵام لەچەند ژمارەیەکی کەمدا دوای شۆڕشی ئیسلامیی ئێران چاپکرانەوەو بەشێوەیەکی سنووردار بڵاوکرانەوە.

---

[١] – المعجم المفهرس لألفاظ أحاديث بحار الأنوار:١، ص٧٤– ٧٥.

[٢] – دروس في نصوص الحديث، سەرچاوەی پێشوو، لا١٣٠– ١٣٤.

کتێبی فەرموودەی کۆکراوەی تر نووسرانەوە، بەڵام فەوتان و ڕووناکییان بەخۆیانەوە نەبینی، گرنگترینیان ئەمانە بوون: (جامع الأخبار في إيضاح الاستبصار)ی عەبدوڵڵەتیفی کوڕی عەلیی کوڕی ئەحمەدی ئەلهەمەدانیی ئەلشامیی ئەلعامیلی[1]و،(جوامع الكلم)ی سەید موحەممەد ئەلجەزائیری[2].

#### هـ- تەفسیری قورئان

قورئان سەرچاوەیەکی ڕاستەقینە پێکناهێنێ بۆ بیری شیعە، چونکە بەلایانەوە بڵاوە کە تێگەیشتنی قورئان لای پێشەوایانی شیعە کورتهاتووەتەوە،وەك ئەوە لایان زانراوە:"ئەو کەسە لەقورئان تێدەگات کە بەقورئان قسەی لەگەڵدا کراوە(موخاتەبەی پێ کراوە)"، بەو هۆیەوە دەبینین کە زۆربەی هەوڵە ڕاڤەکارییەکانی شیعە تەنیا لەکۆکردنەوەی گێڕانەوە تەفسیرییەکاندا کورتهاتووەتەوە، زۆر بەکەمی نمونەی تەفسیری عەقڵیی یان ئیجتیهادیی ئەبینین، نمونەکانی"التبيان"ی تووسی(الطوسي) و "مجمع البيان"ی تەبرسی(الطبرسي) دەگەڕێنەوە بۆ ماوەیەکی پێشتر کە ئەوکات بیری شیعە بەبیری ئیعتیزال کاریگەر بووە، بەڵام دوای زاڵبوونی بیری هەواڵگێڕانەوەیی(إخباري)و بەتایبەت

---

[1] - الذريعة إلى تصانيف الشيعة: ٣٧- ٣٨/ ٥.
[2] - هەمان سەرچاوە٢٥٣/ ٥.

لەسەردەمی سەفەوییەتدا، ئەو هەوڵانە گەمارۆ بوون و لێکۆڵینەوە تەفسیرییەکان کورتهاتنەوەسەر کۆکردنەوەی گێڕانەوەکان و بەش بەش کردن و پۆلێنکردن و هەندێجاریش شیکردنەوەیان.

لەسەر ئەم بنەمایە، گەورە شەرعناسێکی هاوچەرخ لەبارەی تەفسیرکردنی قورئانەوە ئەڵێ: "ئەو کەسە لەقورئان تێدەگات کە موخاتەبەی پێ کراوە، بۆ هیچ کەسی تر نییە تەفسیری قورئان بکات، واتا لەخۆیەوە ئایەتەکان روون بکاتەوە، بەڵام کارکردن بەڕواڵەت و ئیجتیهادو بەڵگە هێنانەوە بەڕواڵەتەکانی قورئان دوای گەڕانەوە بۆ ئەو گێڕانەوانانەی پەیوەست و هاونیشانەکان(المقیدات و القرائن) و نەریت و کاری موجتەهیدو شەرعناسانە، کارێکی ئاساییە"[1].

ژمارەیەکی زۆری زانای شیعە هەبووە لەسەردەمی سەفەویداو بەتەفسیری گێڕانەوەوە سەرقاڵ بوونە، کە ژمارەیان دەگاتە سەدو هەشتا راڤەوان، کە تەفسیری هەموو قورئان یان بەشێکیان نووسیووەتەوە، لەوانە مەلا فەتحوڵڵەی کاشانیی خاوەن تەفسیری(منهج الصادقین) بەزمانی فارسی، میرزا موحەممەد مەشهەدیی خاوەن تەفسیری(کنز الدقائق وبحر الغرائب)، هەروەها ئەلموحەقیقی ئەردەبیلیی خاوەن تەفسیری(زبدة البیان في براهین

---

[1] - بڕوانە پێگەی ئایەتواڵڵە ئەلعوزما موحەممەد صادق ئەلروحانی:
http://www.istefta.com/php/?stfid=٧٦١٢&subid=١٢

أحكام القرآن) و دەیان کتێبی تر و خوێنەریش دەتوانێ سرووشتی گێڕانەوەی زاڵ بەسەر ئەو تەفسیرانەوە ببینێ و بەدووریان بگرێ لەتەفسیری عەقڵیی ئیجتیهادی و تێگەیشتن.

هەندێ لەو تەفسیرانە تاوەکو ئێستا زاڵبوونی خۆیانیان بەسەر قوتابخانە ئایینییەکانی شیعەدا پارێزگاریی کردووە، ئەویش: تەفسیری(نور الثقلین)ی عەبد عەلیی کوڕی جومعە ئەلعەروسیی ئەلحویزییە، ئەو کتێبە بەخولێکی تەفسیریی تەواوی قورئان دادەنرێت کە لەسەر بنەمای گێڕانەوەکان نووسراوەتەوە، تیایدا(١٣٤٢٢) گێڕانەوەی باسکراوە و زۆربەی ئیسنادەکانیشیانی تۆمارکردووەو لەپێنج بەشدا چاپکراوە، بەپێی ئایەت و سورەتەکان دانەر فەرموودەکانی هێناوەتەوە، هەروەها تەفسیری(البرهان في تفسیر القرآن)ی سەید هاشم ئەلحوسێنی ئەلبەحرانی، بەپێی ریزبەندی سورەت و ئایەتەکان گێڕانەوەکانی هێناوەتەوەو رشتەی گێڕانەوەو ناونیشانی سەرچاوەکەشی باس کردووە، دانەر بەشی یەکەمی کە کردووەتە پێشەکی، تایبەت کردووە بۆ کۆمەڵە باسێکی دەسپێك بۆ ناواخنی(باطن) قورئان و تەفسیرو تەئویل[1].

---

[1] - نهضت علمی در دوران صفوي(النهضة العلمیة في العهد الصفوي)، نصر الله شاملي، لەنێو كۆمەڵێ بابەتدا کە زانکۆی ئەسفەهان بڵاوی کردووەتەوە بەناونیشانی:(( Science/ Science Movementساڵی-٢٠٠.

## دووەم: زانستە سرووشتییەکان و بیرکاری

سەقامگیریی سیاسیی لەماوەکانی سەردەمی سەفەویدا، بووە هۆی گەشانەوەی زۆرێکی زانستە سرووشتییەکان، بەتایبەت ئەوانەی دەکرا پادشایان لەدروستکردن و ئاوەدانکردنەوەی شارو ولاتەکاندا بەکاریبهێنن، جا هەولە زانستییەکانی ئەو سەردەمە زۆرێك بواری پزیشکی و بیرکاری و ئەستێرەناسی و شتانی تریشی گرتەوە.

### أ- پزیشکی و دەرماننناسی

لەسەردەمی سەفەوییەتدا هیچ کتێبێکی قەبارە گەورە لەبواری پزیشکیدا نەنووسراوەتەوە، بەڵکو نامیلکەو نامەی بچووك نووسراوەتەوە، کە چەند لێکۆڵینەوەیەکی دیاریکراو یان شیکردنەوەی کتێبە گەورەکانی پێشوو بووە، ئەگەرچی ئەو شیکردنەوەو نامانە گرنگن، بەلام سەردەمی سەفەوییەت لەبواری پزیشکیدا نە تیۆریزمەکارێکی نوێ و نە هیچ پێشکەوتن و تەواوکردنێك دەرنەکەوت بۆ تیۆرە کۆنەکانی پزیشکیی.

دەستپێکردنی سەردەمی سەفەوییەت، رێکەوت بوو بەدانانی کتێبی(زبدة قوانين العلاج- پوختەی یاساکانی چارەسەرکردن)ی موحەممەدی کوڕی هیبەتوللەی ئەلسبزواری، خاوەن نازناوی(نجاة الطبيب)، لەسەر بنەمای شێوازی کتێبەکەی سەید ئیسماعیلی

جورجـانیی نووسـیيەوەی کـە سـاڵی٥٣٨ك/ ١١٤٣ز ئـەو کتێبـەی نووسییەوەو پێشکەشی کردە یـەکێك لەپادشـا خـەوارزم شـاکان کـە بەماوەیەکی زۆر لەپێش سەفەوییەت بوونیان هەبوو، بەشی یەکـەمی ئەو کتێبەی تایبەت کردووە بۆ ئەوەی بەفیزۆلۆجیای مرۆڤ دەناسرێ تـاوەکو ئـەو دەمـە مێژووییـە، پاشـان لێکۆڵینـەوە سـەرەکییەکان دەستپێدەکات کە نەخۆشییە جەستەییەکانی مـرۆڤ ئەخاتەبـەرباس، لاپـــەڕەکانی دواتـــریش ئامـــاژە دەکەنـــە زانســـتی منـــداڵبوون و نەخۆشییەکانی ژنان، هەردوو کتێبەکە بەبەشێکی تایبەت سـەبارەت بـــەدەوا دروســـت کـــردن کۆتاییـــان دێـــت[1]، لـــەدیارترین کتێبـــە نووسراوەکانی تری ئەو بوارە، کتێبی(ستة ضرورية – شـەش شـتی پێویســـت)ە[2]،هـــی یوســـفی کـــوڕی موحەممـــەدی کـــوڕی یوســـف ئەلهەرەویە کە ساڵی٩٤١ك/ ١٥٣٤ز[3].

### ب– ئەستێرەناسی و بیرکاری

لەو ماوەیەدا ژمارەیـەکی زۆر زانـای ئەسـتێرەناس و بیرکاریـنـاس دەرکەوتن، لەوانە: بەهائـەدین موحەممـەدی کـوڕی حوسـێنی کـوڕی

---

[1] - طب در دوره صفويه، سيريل جود، ص٢٠– ٢٣.

[2] - پزیشـکانی سـەردەمی سـەفەوییەت بـاش دەیـانزانی کـە هۆکـارە دەرەکییـەکانیش کاریگـەریی دەکەنەسەر لەشساغیی مرۆڤ و وەهایان تێڕوانین دەکـرد کـە ئـەو هۆکـارە دەرەکییانـە شـەش شـتن و ناویان دەبرد بە: شەش شتە پێویستەکە.

[3] - بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە: تاريخ إيران در دوره صفوي، ژمارەیەك نوێژەو لێکۆڵەری زانکۆی کامبرج، وەرگێڕانی: یعقوب آجند، ص٢٨٨، ٢٩٣.

عەبدولصەمەدی ئەلحاریثیی ئەلعامیلیی بوو، شوێنەوارو جێ دەستی ئـەو لـەبیرکاری و گەردوونناسـیدا بـۆ زەمـەنێکی زۆر بەسەرچـاوەو کتێبی خوێندن مایەوەو قوتابیانی قوتابخانە کۆنەکان سـوودیان لـێ دەکرد، دیارترین کتێبەکانیشی ئەمانە بوون: رسالة الهلالیـة، تشـریح الأفلاك، الرسالة الأسطرلابية، خلاصة الحساب.

کتێبی(خلاصة الحساب)زۆر بەناوبانگ بوویـەوەو لەوڵاتانـدا لـەنێو زانـاو زانسـتخوازاندا زۆر فـراوان بڵاوبوویـەوە، ئەلبـەهائیش لـەژمارە ناسیدا داهێنان گەلێکی نـوێی تیـادا ئەنجامـدا، بەتایبـەت لە(جـەبرو بەرانبــەر کــردن و کۆکردنــەوەو ئــەبینین بەشــێوەی جــەبر بابەتــە بیرکارییــەکان شـیدەکاتەوە، لەهەنـدێکی تریـدا بەشـێوەی ژمـاردن، قوتــابیی لــەوەدا شــتێك دەبینێتــەوە مێشــکی چــالاك دەکاتــەوەو بەهرەی بیرکردنەوەی پێ بەهێز دەکات[1].

لەسەردەمی سـەفەوییدا نامـەی زۆر لـەبارەی ئەستێرەناسـییەوە نووسران، دیارترین دانـەرێکی ئـەو بـوارەش، بەهائـەدین موحەممـەد حوســێن ئەلعامیلییــە کــە لــەبارەی ئەستێرەناســییەوە بــەزمانی عەرەبیی کتێبی(تشریح الاختلاف)ی نووسـییەوەو راڤەیـەکی زۆریـش بەزمانی فارسیی لەسەر ئەو کتێبە نووسراوەتەوە، هەروەها بەهائیی نامەیەکی نووسیووەتەوە بەناونیشانی(تحفه حاتمي)بەزمانی فارسی،

---

[1] - تراث العربي العلمي في الرياضيات والفلك، قدري حافظ طوفان، ص٤٧٤- ٤٨٠.

نامەیـەکی بچـووکە سـەبارەت ئەسـترلاب[1] و پێشکەشـی کردووەتـە حاتەم بەگی وەزیری شا عەباسی یەکەم.

پادشـا سـەفەوییەکان گرنگییـەکی زۆریـان داوەتـە زانسـتی ئەستێرەناسی، نەك تەنیا لەبەرئەوەی کاریگەرییـەکی زۆری هـەبووە لەدەستنیشـانکردنی کاتـە شـەرعییەکان و جەژنـە ئیسـلامییەکان، بەڵکو باوەڕیشیان بـەوە هـەبووە ئەستێرەکان کاریگـەری و ڕۆڵیـان لەڕووداوەکانـدا هەیـە، خـودی شـا عـەباس ئەستێرەناسـێك (ئەسـتێرەگرەوە)یەکی تایبـەتی هـەبووە بەناوی(جەلالـەدین موحەممەد ئەلیەزدی) و شا ڕاوێژی پێ کـردووەو لـەزۆرێك کاروبـاردا بۆ پرس و ڕاوێژی ئـەو گەڕاوەتـەوە، لـەو شـتە سـەیرو سـەمەرانەش ئەوەیە، کە شا صەفی نـاوی خـۆی گۆڕیـووە بـەهۆی پێشـبینیکردنی هەنـدێ ئەسـتێرەگرەوە بـەوەی پادشـا لـەو سـاڵەدا دەڕوخـێ و ئامۆژگارییان کردووە ناوی خۆی بگۆڕێ تاوەکو بەڵای چاوەڕوانکراو لەسەر خۆی لابدات، بۆیە ناوی خۆی گۆڕیووە بۆ شا سلێمان[2].

---

[1] - ئەسترلاب(أسطرلاب): قیبلەنما: ئامرازێکە بۆ پێوانی بازنەکانی خڕۆك(دوائر الكرة) و بەرزایی ئەستێرەکان، سەرچاوە: فەرهەنگی ئەستێرەناسی، کەمال جەلال غەریب، ٢٠٠٤دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم......وەرگێڕ.

[2] - تاریخ سیاسي اجتماعی إیران در عصر صفوي(تارخ إيران السياسي والاجتماعي في العهد الصفوي)، مریم میر احمدي، منشورات امیر کبیر، طهران، ١٩٩٢، ص٢١٠- ٢١٣.

## سێیەم: هونەرەکان

هونـەرە جوانـەکانی سـەردەمی سـەفەوییەت گەیشـتنە ئاسـتی پێشکەوتن و داهێنان، چێژی هونەریی بەوە تایبەتمەندبوو کە هەموو شـێوازە هونەرییـەکانی ئێـران لەڕۆژهـەڵاتی ئەوپـەڕەوە وەریگـرت لەسـەردەمی مـەغۆل و تـەیموری و تێکـەڵ و ئاوێتـە بـوو بەچـێژی ئێرانـی، هـەروەك هونـەری ئێرانیـی ئـەو سـەردەمە تایبەتمەنـدبوو بەمەیلی زیاتر بەرەو لای چیرۆکی پاڵەوانـە کۆنـەکانی ئێـران و وێنـە کردنی ئەو چیرۆکانە لەدەستنووس و شـتە هونەرییەکانـدا، هـەروەك دەبینین کە گرنگییەکی زۆریان بەوێنەکردنی پاڵەوانییەتەکانی ئیمـام عەلی و حوسێنی کوڕی عەلیی داوەو لەشانۆ گشتییەکانی شـارەکانی ئێرانـدا پیشـان دەدران، بەتایبـەت لەئەسـفەهانی پایتـەخت، لـەپاڵ ئەوەشدا شێوەکاران گرنگییـان دەدا بەوێنـە کردنـی هەنـدێ لایـەنی سرووشتی و ئەوەش لەوێنەو زەخرەفەکاندا دەردەکەوت[1].

پیشەسازیی فەرش و جوانکارییەکانی و قیشانی(جۆرە خشتێکە) و تەرلاسـازییش بـووە شـوێنی هانـدان و گرنگیپێـدانی پادشـا سەفەوییەکان[2]، بۆیە سەنتەرە هونەرییەکان لەئێراندا زۆر بوونـەوەو لەتـەواوی شـوێنە هونەرییەکانـدا چـالاکییەکانی زۆرتـر بوونـەوەو

---

[1] - الفنون الإيرانية في العصر الإسلامي، محمد حسن زكي، ص٣٦.

[2] - تاريخ أدبيات إيران، ذبيح الله صفا، ص١٧٦.

پەلیکێشا بۆ دیزاینکردنی کاشیی رەنگاو رەنگ کە دیوارو گومەزەکانی پێ دەڕازێنرایەوەو تەواوی جوانی و رازاوەییە چنراوەکانیش بەدەرکەوتن.

لەکۆتایی سەدەی دەی کۆچی/ شانزەی زایین، شا عەباس بارەگای فەرمانڕەوایی گواستەوە ئەسفەهان و گرنگیی بەجوانکردنەوەو رازاندنەوەی داو مزگەوت و کۆشك و پردو ڕێگەو بانی تێدا دروستکردو شارەکەش بووە زۆرترین شارێکی رۆژهەلأت لەڕووی گەشانەوەو جوانکارییەوەو لەسەدەی یانزەی کۆچی/ حەڤدەی زایین بووە ئەو میحوەرەی کە ژیانی هونەریی ئێران بەدەوریدا بسوڕێتەوە[1].

شا عەباس حەزی بەهونەرە جوانەکان بوو، نمونەی: خۆشنووسی و جوانکاری و وێنەکێشان و گۆزە و کاشیی دروستکردن، لەوپەڕی ئێرانەوە وێنەکێشەکانی بانگدەکرد بۆ ئەسفەهانی پایتەخت و مووچەی بەرزو جیاوکی زۆری پێیان دەدا تاوەکو بەهرە هونەرییەکانیان لەجوانکردنی ئەسفەهاندا بەکاربهێنن، هەروەك سالّی١٠١٠ك/ ١٦٠١ز هونەرمەندانی لەگەلّ خۆیدا برد بۆ مەشهەد لەخۆشنووس و جوانکارو کەسانی تر کاتێك بەپێ خاوسیی بەرێکەوت بۆ بوونیاتنانی مەرقەدی ئیمام عەلیی رەزا کە ئۆزبەکییەکان دوای داگیرکردنی مەشهەد وێرانیان کردبوو.

---

[1] - الظواهر الأدبية في العصر الصفوي، محمد السعيد عبد المؤمن، ص٤٨– ٤٩.

**چوارەم: وێژە(ئەدەب)**

پیاهەڵدان و لاوانەوە بەگرنگترین شتێك دادەنرێن كە دەمی مێژووی سەفەوییەت لەبواری وێژەدا بەرهەمیهێنا، پادشا سەفەوییەكان كاتێك گرنگییان بەشیعرو وێژە دەدا كە ئاراستە بووایە بۆ پشتگیریی مەزهەبی شیعە، ئەوەش بووە هۆی كۆچكردنی ژمارەیەكی زۆری شاعیرو ئەدیبە ئێرانییەكان بۆ هیند، پادشایانی هیندیش پێشوازییان لێیان ئەكردو ئەو شاعیرو ئەدیبانەش شێوازێكی نوێیان لەئەدەبی فارسیدا داهێنا و ناسرا بەشێوازی هیندی.

لێكۆڵەری بەناوبانگیی ئێرانیی لەبواری ئەدەبی فارسیدا، موحەممەد تەقیی بەهار ئەڵێ:"یەكەمین شتێك كە لەئەدەبی فارسیدا دەكەوێتە پێش چاو، زۆریی ئەو كتێبانەیە كە لەبابەتی مەزهەبی و بابەتە ئایینییەكاندا دەركەوتوون، پێنووسی نووسەران لەبابەت فەرموودەو فیقهو بنەماكان بەكارهێنراوە، بۆیە نووسین ئامرازی زانایان بووە بۆ ناساندنی مەزهەبی شیعەو روونكردنەوەی بنەماو شیكردنەوەی ناڕوونییەكانی، تاوەكو بڵاوكردنەوەی گشتییانە بێ و ئاستی بەرزتر بكرێتەوە، نووسین(پەخشان) زمانی ئەو زانستەیە كە قسە لەگەڵ عەقڵ و تێگەیشتندا دەكات، شیعریش زمانی دڵە كە لەگەڵ هەست و خەونەكاندا دەدوێ، جا ئەو دوو زمانە

باشترین ئامرازێک بوون بۆ سەرخستنی شیعەگەریی و نزیکخستنەوەی لەعەقڵ و دڵی ئەو خەڵکە))[1].

لەڕوویەکی ترەوە، ڕەوت و مەیلی سەفەوییەت و زاڵبوونی شەرعناسە توندەکان کاریگەرییان کردە دابەزینی داهێنانی شیعری و بەو هۆیەوە زۆرێک لەشاعیران بۆ هیند هەڵهاتن بۆ ڕۆیشتنە کۆشکی پادشا مەغۆلەکانی هیند، کە زۆرێک پێشوازییان لەو شاعیرانە کردو شێوازێکی نوێ لەشیعری فارسدا دەرکەوت و ناسرا بەشێوازی هیندی[2]، لەگرنگترین شاعیرانی ئەو سەردەمەش، مەولانا ضەمیریی ئەسفەهانی و موحتەشەم قاسانی و مەولانا وەحشیی یەزدی و وەلی دشت بیاضی و شێخ بەهائیی بوون[3].

بڵاوبوونەوەی شیعری مەزهەبییانە بەماوەیەکی کەمی پێش دروستبوونی دەوڵەتی سەفەوییەت دەرکەوت، زۆرێك شاعیر هەبوون شیعریان لەپیاهەڵدانی ئالو بەیت دەوت و دەگریان بۆ شەهیدکراوەکانیان و هەندێ بیروباوەڕی شیعەیان ڕاڤەدەکردو بەرگریان لێ دەکرد لەبەردەم سووننەکاندا، ئەوەیە کە دەتوانین پێی بڵێین شیعری مەزهەبی، جا ئەم ڕەنگ و شێوە شیعرییە

---

[1] – سبك شناسي، محمد تقي بهار، ج٣، ص٢٥٦.

[2] - تاريخ روابط إيران وهند(تاريخ علاقات إيران والهند)، رياض الإسلام، الترجمة إلى الفارسية: محمد باقر آرام، مطبعة سبهر، طهران، ١٩٩٤، ص٢٥١، ٢٦٢.

[3] - خلد برين، محمد يوسف واله أصفهاني، منشورات مؤسسة موقوفات الدكتور افشار، طهران، ١٩٩٣، ص٤٧٣- ٤٧٧.

ئەگەرچی لەماوەی پێشتری ئەدەبی فارسیدا بوونی هەبوو، بەلأم لەرووی زۆرییەوە بەئەندازەی ئەم ماوەیە نەبوو، سوڵتانە قەرەقونیلوکان(دەوڵەتی تورکمانی) مەیلی بنەماو بیروباوەڕی شیعەیان هەبوو، ئامادەیی شیعە لەخۆراسان کەمتر نەبوو لەچاو ئەوەی لەرۆژئاوای ئێراندا هەبوو، تایەفە گەلێکی بەهێزی شیعە بوونی هەبوو لەهەندێ شاردا، وەك سبزوارو مەشهەدو ویلایەتە دوورەکان.

بەهەرحاڵ ئەم رەنگە شیعرییە شێوەیەکی نوێی وەرگرت و لەسەردەمی سەفەوییەتدا زیاتر مەودای کێشا کاتێك بانگەوازی شیعە گەیشتە لوتکەی خۆی.

شیعری مەزهەبیی ئەو ماوەیە دوو بابەتی شیعری کردە ئامرازی دەربڕین، ئەویش: پیاهەڵدان و لاوانەوە بوو لەبارەی عەلیی کوڕی ئەبو تالیب و کوڕو نەوەکانی، زۆربەی لاواندنەوەکانیش سەبارەت بەئیمامی سێیەم بوون، حوسێنی کوڕی عەلی و پاشان ئیمامە شەهیدکراوەکانی تر[1].

---

[1] - الظواهر الأدبية في العصر الصفوي، محمد السعيد عبد المؤمن، مكتبة الأنجلو المصرية، ص٢٣-١٤٨، بۆ زیاتر زانیاریی سەبارەت بەمێژووی دانیشتنی پرسەی شیعەو ئەو بابەتە فارسییانەی بۆی زیاتر کراون، بڕوانە: تراجيديا كربلاء، ابراهيم الحيدري، منشورات دار الكتاب الإسلامي، قم.

**پێنجەم: تەلارسازی**

کاتێك شا عەباس لەساڵی١٠٠٦ك/ ١٥٩٧ز پایتەختی گواستەوە ئەسفەهان و سوور بوو لەسەر رازاندنەوەی و هەستا بەدروستکردنی زۆرێك تەلاری گەورە تیایداو گۆڕەپان و باخچەی گشتیشی دروستکردو هەوڵێکی زۆری لەوەدا خەرجکرد، ئەو هەوڵانەشی لەو شوێنەوارە زۆرانەدا دەردەکەوێ کە دوای خۆی بەجێیهێشت و مێژوونووسان و رۆژهەڵاتناسە گەڕیدەکانی ئەوکات تۆماریان کردووە، وەك ئەنجامێك لەوەی ئەسفەهان پێیگەیشتبوو لەپێشکەوتن و جوانییەك کە هیچ سەردەمێکی پێشتر بەوە نەگەیشتبوو، نازناوێکی گەورەی وەرگرت کە بووە(أصفهان نصف جهان)واتا: ئەسفەهان نیوەی جیهانە، ئەمەش کاتێك بوو کە ئەسفەهان لەوپەڕی جوانی و رازاوەیی و مەزنیدا بوو، لەڕووی شوێنەواری بەرزی داهێنان و جوانییەوە لەسەرووی تەواوی شارەکانی ئێرانەوە بوو، گەشتیار لەهەموو شوێنێکیدا چێژی لەهونەری بەرزی ئەو شارە ئەکردو شار ببووە پێشەنگای هونەری، لەئەنجامی زۆر گرنگیدانی شا عەباس بەئەسفەهان و گرنگیدان بەجوانکردن و رازاندنەوەی، پایتەخت قەرەباڵغ هاتەوە بەدانیشتوان و گەشتیاران، تائەوەی هەندێك باسیان کردووە، کە دانیشتوانی

ئەسفەهان لەسەردەمی شا عەباسدا گەیشتبووە دەورووبەری شەسەد هەزار کەس[1].

زۆربەی ئەو تەلارانەی لەسەردەمی شا عەباسدا دروستکراون تاوەکو ئەمڕۆ ماونەتەوەو باس لەجوانیی هونەریی ئەکەن، زۆربەی گەشتیاران سەردانی ئەکەن و چێژ لەجوانییە هونەرییەکەی دەکەن، بەلأم هەندێ لەو شوێنەوارانە لەڕۆژگاری فەرمانڕەوای قاجاریدا دەستی کاولکردنی پێگەیشت، بۆیە زۆربەی ئەو شوێنەوارو تەلارانەی تاوەکو ئێستا ماون، کەوتوونەتە کەناری لای راستی رووباری زایندە رود کە گەشتیارە بیانییەکان وەسفێکی دەکەن تاوەکو ئێستا نمونەی بوونی نییە، گرنگترین ئەو شوێنەوارانەی کە شا عەباس لەئەسفەهاندا بەجێیهێشتووە ئەمانەن:

**میدان نقش جهان:** ئەم گۆڕەپانە(مەیدان)ئەکەوێتە نزیکەی ناوەڕاستی شاری ئەسفەهانەوە، گۆڕەپانێکی گەورەیەو ئامادە کراو بووە بۆ شوێنی پێشبڕکێ و سواربوونی ئەسپ و تیرهاوێشتن، هەندێجاریش بۆ سازدانی شەڕە کەڵەشێر، دوای ماوەیەك ناوی گۆڕەپانەکە لە(نقش جهان)ەوە گۆڕاوە بۆ شا عەباس[2].

---

[1] - أصفهان و آثار تاريخي آن(أصفهان و آثارها التاريخية)، عباس إقبال، مجلة يادكار، السنة الثانية، العدد٩، ١٣٢٥م، ص٢.

[2] - إيران در زمان صفويه(إيران في العهد الصفوي)، ص٢٦٦.

**عـــالی قـــاپو:** دوای ماوەیـــەك لەگواســـتنەوەی پایتـــەخت بـــۆ ئەسفەهان، شا عـەباس پێداگربوو تـەلارێکی بچووك دروست بکـات درێژبێتـەوەو بڕوانێتـە گۆڕەپـانی نقـش جهـان لـەڕووی ڕۆژئـاواوەو تەلارەکـە بکاتـە بارەگـای فەرمانڕەواییەکـەی و بـەو تـەلارە نوێیـە وترا(عـالی قاپو)واتا(دەرگـای بـەرز)، ئـەم کۆشـکە سـێ قاتـە، هـەر قاتێکی دەبێتە دوو قـاتی تـر، واتـا لەڕاسـتیدا شـەش قاتـەو هـەموو قاتەکان چل و هەشت مەتر بەرزن، بەرزیی ڕێڕەوی سەرەکیی بیست و هەشت مەترە[1].

**مزگـەوتی شـێخ لوتفـوالله:** ئـەم مزگەوتـە لەلاشـانی ڕۆژهـەڵاتی گۆرەپـانی نقـش جهانـەوە دروسـتکراوە، واتـا لـەڕووی بەرانبـەری مزگـەوت و قوتابخانـەی سـەر بەمزگەوتەکـە تـاوەکو ببێتـە شـوێنی نیشتەجێ بوونی شێخ لوتفوڵلای ئەلعامیلی، دەگمەنە نمونـەی ئـەم مزگەوتە لەتەواوی دونیادا بوونی هـەبێ، لەبـەر ئـەو جـۆرە بـەردەی قیشـانی کـە لـەجوانکردنی گومەزەکـەدا بـەکارهێنراوەو نـاوەوەو دەرەوەی گومەزەکەی ڕازاندووەتەوەو زۆرێك ئایەت و دەستەواژەی

---

[1] – هەمان سەرچاوە.

جیاوازی لەسەر نووسراوەو پایەبەرزیی ئەو مزگەوتەو جوانییەکەی دەردەخات[1].

**مزگەوتی شا:** ئەم مزگەوتە ئەکەوێتە تەنیشتی باشووری گۆرەپانی نقش جهانەوە، واتا ئەکەوێتە ناوەڕاستی تەلاری عالی قاپو و مزگەوتی شێخ لوتفواللەوە، سێ گومەزو چوار تارمەی لەخۆگرتووە، گەورەترین تارمەی ئەوەیە کە رووی لەقیبلە کردووە، گومەزی تارمە گەورەکە لەدوو گومەزەکەی تر گەورەترە[2].

**شەشەم: گۆرانی و میوزیک**

بابەتی حەڵاڵ و حەرامیی گۆرانی و میوزیک لەو بابەتانەیە کە مشتومڕێکی فراوانیان لەسەر هەبووە لەو دەمە مێژووییەدا،هەندێك سەرەتای دەرکەوتنی مشتومڕی سەبارەت بەگۆرانیی لەفیقهی شیعەدا دەگێڕنەوە بۆ نامەی زانای بەناوبانگ مەلا باقری خۆراسانی، کە بەناوبانگ بووە بەلێکۆڵەر(ئەلموحەقیق) سبزواریی کۆچکردووی ساڵی١٠٩٠ك/ ١٦٧٩ز کە نامەیەکی سەربەخۆی لەبابەت گۆرانیی نووسیووە[3].

---

[1] - هەمان سەرچاوە.

[2] - آثار ملي اصفهان(آثار اصفهان الوطنية)، ص٦٦٤، الشاه عباس الكبير، ص١٣٠- ١٣٦.

[3] - ميراث فقهي غناء وموسيقي، رضا مختاري، ج٣، ص١٥٩٥،نشوء وسقوط الدولة الصفوية: كمال السيد: ص٢٤١- ٢٤٢.

هەڵوێستی سوڵتانەکانیش لەبابەت گۆرانی و میوزیك گۆڕانکاریی بەسەردا دەهات و لەحەلاڵەوە حەرام دەکرا، ئەوەش بەپێی مەودای کاریگەریی شەرعناسە توندەکانەوە بوو بەسەر سوڵتانەکانەوەو ناچارکردنیان کە شەریعەت جێبەجێ بکەن، ئەوەی نوێ بوو لەو دەمە مێژووییەدا، دەرکەوتنی جۆرێکی تایبەتی گۆرانی و میوزیك بوو تایبەت بەپرسە گێڕان کە ساڵانە بەبۆنەی کوژرانی ئیمام حوسێنەوە سازدەکراو تاوەکو ئێستا لەئێراندا بەردەوامەو گوازراوەتەوە وڵات گەلێکی عەرەبیشەوە نمونەی عێراق و لوبنان و بەحرەین[1].

## حەوتەم: کانزاکان

لەسەردەمی سەفەوییەتدا هەندێ کانزای نمونەی مس و ئاسن بەکارهێنرا لەدروستکردنی قاق و مەنجەڵدا، هەروەها لەدروستکردنی کەرەستەکانی شەڕ، زۆرترین کارە هونەری و جوانکارییەکانیش لەشتی ماڵاندا بەکاردەهێنرا، وەك قاپ و مەنجەڵ و پەرداخی خواردن و خواردنەوەو زۆرجاریش وێنەیان لەسەر دەنەخشاند،

[1] - نشوء وسقوط الدولة الصفوية، كمال السيد، ص٢٤١- ٢٤٢،بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە:تراجيديا كربلاء، إبراهيم الحيدري، سەرچاوەی پێشوو.

هەروەك شیعری عیرفان و دێرە شیعری هەندێ شاعیری بەناوبانگیان لەسەر دەنووسی[1].

**هەشتەم: رستن و چنین**

لەڕووی هونەرییەوە، قوماشی سەفەوی لەدیزاینکردنی کراس و عەبا بەبەردی گرانبەها بەلوتکەی پێشکەوتنی خۆی گەیشتبوو، قوماشی ئاورێشمینی سەرنجڕاکێش و نەخشێنراو بەگژوگیا لەو سەردەمەدا بەرهەم هێنرا، کاشان و یەزدو ئەسفەهان و قوم و ساوە لەشارە گرنگەکانی پیشەسازیی ئاورێشم بوون و قوماشی سەفەوییانە بەشێوەیەکی زۆر هەمەجۆر بوو، بەڵام ئاورێشم لەڕووی هونەرییەوە گرنگترو تایبەتتر بوو[2]، قوماشی ئاورێشم بەسێ جۆر دەچووە بازارە خۆماڵییەکانی سەردەمی سەفەوییەوە: ئاورێشمی سادە، ئاورێشمی چنراو عەبا.

بەرگی پادشایان و پەردەو ئەو جوانکارییانەی کە بەدیاریی دەدرایە نوێنەران و پادشایانی وڵاتان، زۆرترین ئەو بەرهەمانە بوون کە ئەو قوماشانەیان بۆ بەکاردەهێنرا.

وێنەی مرۆڤ و ئاژەڵ و رۆك باکگراوەندی زۆربەی نەخشەکان بوو، کارگە شاهانەییەکانی پایتەختەکان و شارەکانی تر گەورەترین

---

[1] - تاريخ فرهنك وتمدن ايران در دوره صفوي(التاريخ الثقافي والحضاري لإيران في العهد الصفوي)، عباس قدياني، ص١٤٥– ١٤٦.

[2] - تاريخ إيران– دوره صفويان، ص٣٩٧– ٤٠١.

کارەگەکانی ئەو قوماشە بوون و بەناوبانگترینی بازاڕە جیهانییەکان بوو[١].

رستن زۆرترین پیشە تەقلیدییەکانی ئێران بوو، هەروەك رەنگکردنی هونەریی لای ئێرانییەکان بڵاوبوویەوەو رەنگکردنی هونەرییانەی رەنگە سرووشتییەکان جوانی و بەردەوامییەکی زۆری بەهونەری رستن دابوو، سەردەمی سەفەوییەتیش پێشکەوتنێکی گەورەی لەو هونەرەی بەخۆوە بینی، نمونەی هونەرەکانی ترو هەندێ شوێنەواری رستنی ئەو دەمە مێژووییەمان بۆ ماوەتەوە، لەوانە رستنی فەرش گەلێکی گرانبەها بەدەزووی ئاورێشمی و ئاڵتوونی[٢].

### تۆیەم: وێنەو خۆشنووسی و زەخرەفە

شا عەباس زۆر حەزی بەوێنە بوو، پێشوازیی و خۆشحاڵ دەبوو بەشێوەکارە رۆژئاواییەکان، فەرمانی بەوێنەکێشێکی پورتوگالیی داوە لەیەکێك لەکۆشکە بەناوبانگەکانی شیراز کە بە(عمارت کلاه فرنکی)ناسراوە کۆمەڵە وێنەیەك هەڵبکۆڵێ، بۆ جوانکردنی ماڵان و سەقفی خانووەکان وێنەیان دەکێشا، زۆرجار ئەو وێنانە وێنەی

---

[١] - تاريخ فرهنك وتمدن ايران در دوره صفوي(التاريخ الثقافي والحضاري لإيران في العهد الصفوي)، عباس قدياني، ص١٤٥– ١٤٦.

[٢] – تاريخ سياسى واجتماعى إيران در عصر صفوي(تاريخ إيران السياسي والاجتماعي في العهد الصفوي)، مريم مير أحمدي، ص٢٤٣.

کەسێتی گەلێکی ئایینی یان ڕوحانی یان سیاسیی ناسراوی ئەو سەردەمە بوونە، وەکو: میرفندرسکی، شێخ بەهائی، شا عەباس و ئەوانی تر، هەندێ وێنەی تر بۆ کەسێتیی گەلێکی ئەفسانە بوونە وەکو وێنەی ڕۆستەم و سوهراب، یان کەسێتییە ئایینییەکانی نمونەی ئیمام عەلی و هەردوو کوڕەکەی کە حەسەن و حوسێنن، جا گرنگترین وێنەکێشە ناسراوەکانی ئەو سەردەمە: مانی شیرازی، کەمالەدین بەهزاد بوون[1].

گرنگترین خۆشنووسەکانیش: خواجە مەحمود سیاوشی ناسراو بە"مەحمود ئیسحاق" و موحەممەد حوسێن تەبریزیی بوون[2].

هەروەها پیشەسازیی گۆزەی چینی و کاشیی پەرەیسەند، چونکە شا عەباس هەندێ هونەرکاری چینیی بانگهێشتکرد تاوەکو ئێرانییەکان فێری سەنعەتی گۆزەی چینیی بکەن، لەوکاتەشەوە ئەو هونەرە لەئێراندا زۆر گەشەی کردو داهێنانی زۆریان تیادا کرد، هەروەك سەنعەتی کاشیی لەو سەردەمەدا گەشەی کردو هونەرکارەکانیش لەجوانکردنی مزگەوت و کۆشکەکاندا داهێنان و بەهرەی خۆیانیان بەکارهێنا[3].

---

[1] - شاه إسماعيل صفوي، محمد بنامي، منشورات كتاب نمونه، طهران، ص٢٤٥- ٢٥٠.

[2] - زندكي شاه عباس أول، نصر الله فلسفي، منشورات جامعة طهران، ص٣٧٤- ٤٠٧.

[3] – تاريخ صفوية، احمد تاجبخش، منشورات نويد شيراز، الطبعة الأولى، ١٩٩٨، ص١٠- ٢٠٠.

# بنەماڵەی سەفەوییەت
# شێخ و پادشاکانی

"موحەممەد ئەلمەعموری* "

دەوڵەتی سەفەوییەت وەرچەرخانێکی گەورەی نواند لەمێژووی وڵاتی فارس(ئێرانی ئێستا) دوای ماوەیەك لەچوونە نێو ئیسلامەوە، بنەماڵەی سەفەوییەت توانیی یەکەمجار دەسەڵاتی روحیی خۆی بپارێزێ و دووەمیش پارێزگاریکردنی دەسەڵاتە سیاسییەکەی بەسەر ناوچەیەکی فراوانی ئەو وڵاتەداو ئینجا زاڵبوونی بەسەر تەواوی وڵاتەکەو هەندێجاریش بەسەر وڵاتانی دەوروبەریدا.

دەزانرێ کە سەفەوییەکان تورك بوونەو زۆربەشیان بەباشیی زانیوویانە بەیەکێك لەدیالێکتە تورکییەکان قسە بکەن، شێخ صەفیەدینی ئەردەبیلیی باپیرە گەورەی سەفەوییەکان بەباشیی زمانی تاتیی زانیووە، کە یەکێکە لەزمانە نێوخۆییەکانی خەڵکی

* – نووسەرێکی عێراقییە.

ئازەربێجــان، ئەمـــەش لەڕێگـــەی تەماشــاکردنی شــیعرەکانییەوە دەبینرێت کە بەزمانی تاتی نووسیوێتی، بەڵام هەنـدێ لێکۆڵینـەوەی مێژوویی دووپاتی دەکەنەوە کە شێخ صەفیەدین وەچەی هەشـتەمی پادشا(فەیروز شا رزین کلاە)یە، فەیرزو شا کوردێکی خەڵکی سـنجار بووە، کە کوردەکان لـەئازەربێجان و ئـەران بلاّوبوونەتـەوە، ئـەویش لەسەدەی چواردا کۆچی کردووە بۆ شاری ئـەردەبیل و لەنزیکییـەوە نیشتەجێ بووە.

لەگەڵ ئەوەشدا شێخە سەفەوییەکان خۆیان دەدەنەوە پاڵ ئیمام موسای کازم، حەوتەمین ئیمامەکانی شیعەو رەچەڵەکێکی درۆیان بۆ خۆیــان دروســتکردووە بــەوەی لەڕێگــەی ئیمــامی حەوتەمــەوە دەگەنـەوە بەپەیامبـەری خوا(صـلی اللە علیـە وسـلم) و بانگەشـەیان کـردووە کـە نوێنــەری پەیامبــەری خــواو ئیمـام مەهـدین، بەپشـت بەستنیان بەوەی رەچەڵەکیان بۆ پەیامبەر دەگەڕێتەوە، بۆیە پادشا ئیسماعیل بەو بانگەشە توانیی جەماوەرێتییەکی بەرفراوانی خـەڵکی ئێران بۆ خۆی رابکێشێ کە مێژووییانە لەگـەڵ بنەماڵـەی پەیامبـەردا هاوسۆزبوون.

ئەحمەد کیسرەویی لێکۆڵەری هاوچەرخ و لێکۆڵەر گەلێکی تـریش باوەڕیان وەهایە، کە سەفەوییەت هـەرگیز سـەید نـەبوون، دووپـاتی

دەکاتەوە کە رەچەڵەکی سەفەوییەکان دەگەڕێتەوە بۆ فەیروز شا زرین کلاە کە کوردێکی خەڵکی سنجاری باکووری عێراق بوو[1].

### شێخ صەفیەدین

صەفیەدینی دامەزرێنەری تەریقەتی سەفەوییەت، بەیەکەمین کەسێك دادەنرێت توانیبێتی تەصەوف لەخزمەت منداڵ و بنەماڵەکەیدا بەکاربهێنێ.

هەر لەسەرەتای تەمەنییەوە، شێخ صەفیەدینی ئەردەبیلیی گرنگی بەزانستەکانی سەردەمی خۆی داوەو گەشتی شارە جیاوازەکانی کردووە بۆ گەڕان بەدوای موریدو رابەری تەریقەتدا، ئەنجامی گەشتە زۆرەکانی چاوپێکەوتنی بوو بەشێخ تاجەدین ئیبراهیمی گەیلانیی ناسراو بەشێخ زاهید(٦١٥ك/ ١٢١٨ز– ٧٠٠ك/ ١٣٠٠ز) لەشاری لاهیجانی سەر بەگەیلان.

صەفیەدین ژیرو وریابوو، لای شێخ زاهید گەیلانیی مامۆستای خاوەن رێزو پێگەیەکی گەورە بوو، ئەوتریێ هەر لەیەکەم بینینەوە ژیریی شێخ صەفیەدینی هەستپێکردووەو بەیەکێك لەڕزگارکەرە

ٌ

---

[1] - شيخ صفي وتبارش(الشيخ صفي وأجداده)، أحمد كسروي، طهران، عام١٣٣٢م، ص٥.
سنجار واتا(شەنگال) و ناوبردنیشی بەباکووری عێراق، ئەوە شتێکی ئاساییە بەلای هەندێ نووسەری عەرەبی عێراقی و هەر وڵاتێکی ترەوە و فوورس و گرانە ناوی کوردستان بهێنێ!– وەرگێڕ.

گەورەکانی جیهانی داناوە، تائەو ئاستەی بەجێگرو راسپێردراوی خۆی هەڵبژاردووە[1].

دوای ئەوەی شێخ صەفیەدین بەو شانازی و گەورەییە گەیشت، لەلایەن کوڕی شێخ زاهیدەوە رووبەڕووی ناکۆکیی هاتەوە کە ناوی جەمالەدین عەلیی بوو، لەنێو شوێنکەوتەکانی تەریقەتدا ململانێ و ناکۆکیی دەرکەوت، تائەوەی شێخ صەفی توانی هەمووان قایلْ بکات ویلایەتی روحیی پشتاو پشت نییەو کوڕی رابەری(مورشیدی) تەریقەت خاوەن سیفەتی دەسەڵاتی روحیی نییە تاوەکو پێویست بێ شوێنکەوتووانی تەریقەت گوێڕایەڵی بن، بەو هۆیانە جەمالەدین عەلی، شیاوی جێگرەوەیی شێخ زاهیدی باوکی نییە.

ئەوەی جێی تێبینییە، ئەوەیە کاتێك شێخ صەفیەدین دەبێتە شێخی تەریقەت، رایدەگەیەنێ کە جێگرەوەیی تەنیا لەباوکەوە بۆ کوڕ دەگوازرێتەوە[2].

شێخ بەو بڕیارە ویستی سەرکردایەتیی تەریقەتەکە لەبنەماڵەی سەفەوییدا بپارێزێ، تاوەکو تواناو دەسەڵات لەدەست بنەماڵەکە دەرنەچێ.

---

[1] - إيران عصر صفوي(إران في العصر الصفوي)، راجر سيوري، الترجمة إلى الفارسية، كامبيز عزيزي، طهران، منشورات سحر، الطبعة الثانية، ١٩٨٧، ص٨.

[2] - دنباله جستجورد تصوف إيران(تتمة البحث عن التصوف في إيران)، عبد الحسين زرين كوب، منشورات امير كبير، طهران ، الطبعة الثانية، ١٩٩٧م، ص٢٣٢.

ئەم کارە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە صەفیەدین ویستوویەتی ئەو تەریقەتە سۆفیگەرییەی کە خۆی بووە گەورەترین شێخەکانی، لەبەرژەوەندیی خۆی و گەورەیی پێگەی بنەماڵەکەیدا بەکار ببات[1]، لەپۆستی رابەڕی بالآدا پۆست و پێگەیەکی وەرگرت هاوشێوەی پێگەی سوڵتانەکان و دەسەڵاتدارە سیاسییەکان بوو، لەئەردەبیلدا خانەقای تەریقەتەکەی دامەزراندو ئەو تەریقەتە لەدواتردا بووە سەنتەری هەستانەوەیەکی بەرفراوانی ئایینی جەماوەریی.

شێخ هەژارو بێ نەواکانی پارێزگاریی دەکرد، بۆیە ماڵەکەی لەئەردەبیلدا بووە پەناگای بێ بەشکراو و هەژارەکان و لەژیانی خۆیدا بەخاوەن زۆرێك کەرامات ناسرا، جەماوەرێتییەکەی تەنیا لەپیرۆزی و کەرامات و پێگەی مەعنەوییەوە وەرنەگرت، بەڵکو بەهۆی پێگە کۆمەڵایەتییەکەی و ئەو سەروەتە زۆرەشییەوە بوو کە لەسەروەت و دیارییە زۆرەکانی رۆژگارەوە پێیدەگەیشت، کە لەخۆشەویستان و جەماوەریبوونی نێو خەڵکەوە بۆی ببووە دەسکەوت[2]، هەندێ پادشاو گەورە پیاوانی دەوڵەتیش پاڵپشتیی شێخ صەفیەدینیان دەکردو خۆشیاندەویست.

[1] - إیران عصر صفوي(إيران في العصر الصفوي)، راجر سيوري، الترجمة إلى الفارسية، كامبيز عزيزي، طهران، منشورات سحر، الطبعة الثانية، ١٩٨٧، ص٨.

[2] - تاريخ إيران در دوره صفويان(تاريخ إيران في العهد الصفوي)، زمارەیەك توێژەو لێکۆڵەری زانکۆی کامبرج، وەرگێڕانی: يعقوب آجند،منشورات جامي، ٢٠٠١م، الطبعة الأولى، ص١٠.

(حەمدوالله‌ ئەلموستەوفی) هاوسەردەمی شێخ صەفیی بوو، کتێبێکی مێژووییشی هەیە تیایدا باس لەڕووداوەکانی سەردەمی خۆی دەکات بەناونیشانی(تاریخ جزیدە)، واتا"مێژووی هەڵبژاردە"کاتێك باس لەڕووداوەکانی ساڵی٧٣٠ك/ ١٣٢٩ز ئەکات و مێژووی پێنج ساڵی پێش مردنی شێخ صەفیەدینەو ئەڵێ:((شێخ صەفیەدین تاوەکو ئێستا لەژیاندا ماوە، پیاوێکی ژیرەو جەماوەرێتییەکی گەورەی هەیە، بەرەکەتی سرنجڕاکێشیی ئەو و کاریگەریی ئەو لەسەریان مەغۆلەکانی رێگر کرد لەوەی ئازاری خەڵك بدەن، ئەمەش کارێکی مەزنە))[1].

شێخ صەفیەدین پەیوەندییەکی باشی هەبوو لەگەڵ فەرمانڕەوایانی سەردەمی خۆیدا، چونکە هەرگیز دەستوەردانی کاروباری سیاسەتی نەدەکرد، باسدەکرێ کە خواجە رەشیدەدین فەزلوللەی وەزیری غازان خانی مەغۆلیی موریدی بوو، رێز دەگرت و شکۆداری دەکرد و هەموو ساڵێك مەسرەفی خانەقاکەی بۆ ئەردەبیل دەنارد و ئامۆژگاری و وەسێتی دەکرد کە رێزی لێ بنرێ[2].

شێخ صەفیەدین زۆرێك موریدو خۆشەویستی هەبوو لەناوچەکانی جیهانی ئیسلامیدا بلاوبوون و ئەوانیش هۆکاری سەقامگیرکردنی

---

[1] - تاريخ كزيده، حمدلله مستوفي،باهتمام عبدالحسين نوايي، منشورات امير كبير، طهران، عام١٣٣٩م، ص٦٧٥.

[2] – تشكيل دولت صفوي(قيام الدولة الصفوية)، محمد كريم يوسف جماني، منشورات اميركبير، اصفهان، الطبعة الأولى، ١٩٩٣م، ص٥٦.

حکومەتی تازە لاوی سەفەوییەت بوون و زەمینە سازییەکی زۆر باشیان کرد بۆ دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی تەریقەتە سۆفییەکان لەئێراندا[1].

## شێخ صەدرەدین

دوای مردنی شێخ صەفیەدین، شێخ صەدرەدینی کوڕی (کۆچکردووی ساڵی٧٩٣ك/ ١٣٩٠ز) جێگەی گرتەوە بۆ سەرکردایەتیکردنی تەریقەتی سەفەوییەت و خانەقای ئەردەبیلیش پێگەیەکی گەورەی وەرگرت و زۆرێك شوێنکەوتەی تەریقەتەکە لەسەردەمی ئەودا بۆ شار گەلێك کۆچیان کردو جووڵەیەکی موژدەپێدانی گەورەیان لەشوێن و ناوچەکانی دەورووبەری ئەردەبیل دەستپێکرد.

ماوەی ژیانی شێخ صەدرەدین هاوکاتی فتوحاتەکانی تەیمورلەنگ بوو، ، وتراوە کە تەیمور لەنگ گرنکیی بەشێخ صەدرەدین داوەو چەند جارێك چاوی پێکەوتووە، لەماوەی جەنگە زۆرەکانیدا چەند جارێك بەئەردەبیلدا تێپەڕیوەو چاوی کەوتووە بەخواجە صەدرەدین، بەڵام ئەم گێڕانەوەیە بەهێز نییە، هەندێ

---

[1] - بروانە: سيري در تصوف وعرفان إيران(نظرة في التصوف والعرفان الإيراني)، محمود عبدالصمدي، منشورات شرق، طهران، ١٩٨٢م، ص٥٦- ٥٧.

مێژوونووس بەتایبەت مێژوونووسە کۆنەکان گومانیان لەو چیرۆکە هەیە.

"ئەسکەندەر منشی" کە یەکێکە لەنووسەرە بەناوبانگەکانی سەردەمی شا عەباسی سەفەوی، لەکتێبەکەیدا ئەڵێ:"لەنێو تێکڕای خەڵکدا بەناوبانگە کە میر تەیمورلەنگ چاوی کەوتووە بەسوڵتان صەدرەدین موسا، بەلاّم لەڕاستیدا ئەوەی تەیمورلەنگ چاوی پێکەوتبێ سوڵتان خواجە عەلیی بووە و تاوەکو ئێستا ئەمەم لەو کتێبە مێژووییانەدا نەبینیووە کە باسیان لەبنەماڵەی سەفەوییەت کردووە"[1]، ئەگەرچی هەندێ مێژوونووسی هاوچەرخیش گومانیان لەو چاوپێکەتنە کردووە، بۆ نمونە، ئەحمەد کیسرەوی، گێڕانەوەی چاوپێکەوتنی خواجە عەلیی لەگەڵ تەیمور بەگێڕانەوەیەکی هەڵبەستراو و ناڕاست دادەنێت[2].

### شێخ خواجە عەلی

دوای مردنی صەدرەدین، شێخ خواجە عەلیی کوڕی جێگەی گرتەوە، لەم بارەیەشەوە گێڕانەوە گەلێکی زۆری شیعە هەیە لەبارەی پلەو پایەی شێخ خواجە عەلی لای تەیمور، گێڕانەوەیەك

---

[1] - عالم آراي صفوي، المؤلف المجهول(نووسەری نەناسراو)، منشورات بنياد فرهنك إيران، طهران، ١٩٧٠م، ص١٦٢.

[2] - بازهم صفوية(الصفوية مجددا)، أحمد كسروي، مجلة آينده، العدد١١، اسفند١٣٠٦م، طهران؛ ص٨٠٦.

ئەڵێ کە تەیمور لەخواجە عەلیی ترساوە کە ئەوەندە خەڵك گرنگیی پێ دەدەن و توانای مەعنەویی هەیە، بۆیە لەیەکێك لەچاوپێکەوتنەکانیدا لەنێو پەرداخێکدا ژەهر خواردی دەکات، پاشان دەروێشەکانی مەجلیسەکەی دەستدەکەنە خوێندنەوەی زیکرە عیرفانییەکان و خواجە عەلیش دەچێتە ناویان و حاڵ دەیانگرێت و دەست دەدەنە سەماو گوێبیستی عیرفانی، بەهۆی عەرەقکردنەوەی زۆرەوە ژەهرەکە لەلاشەی شێخ دەردەچێ، تەیموریش بەوە سەرسام دەبێ و لەو رۆژەوە دەبێتە یەکێك لەمریدەکانی شێخ و فەرمان بەشوێنکەوتەکانی دەکات ئازاری نەدەن و وەقفێکی زۆر بەخۆی و شوێنکەوتەکانی دەدات و وەك رێزگرتنێك لەشێخ، تەیمور هەموو ئەو دیل گەلە ئازاد ئەکات کە لەپەلاماردانی عوسمانییەکاندا دیلی کردبوون[1].

ئەم چیرۆکە راست بێ یاخود نە، ئەوە لەرووی مێژووییەوە شتێکی دووپاتکراوە کە لەسەردەمی تەیمورییەکاندا رێزی سەفەوییەکان زیاتر بووەتەوە[2]، بەجۆرێك تەیمورخان دێهات و

ۀ

---

[1] - إيران عصر صفوي(إران في العصر الصفوي)، راجر سيوري، الترجمة إلى الفارسية، كامبيز عزيزي، طهران، منشورات سحر، الطبعة الثانية، ١٩٨٧؛ ص١٢و ١٣.

[2] - تاريخ أدبيات إيران(تاريخ الأدب الإيراني)، إدوارد براون، ترجمه إلى الفارسية: رشيد ياسمي، منشورات مكتبة ابن سينا، الطبعة الثالثة، طهران، ١٣٤٥م: المجلد الرابع، ص٥٦.

کشـتوکاڵ گـەلێکی زۆری لەناوچـە جیاوازەکـانی ئێرانـدا کڕیـووەو کردوویەتییە دیاریی بۆ کوڕانی خواجە عەلی[1].

پاشان تەیمور بڕیاریدا زەوییەکانی ئەردەبیل و دێهاتـەکانی سـەر بەئەردەبیلیش بکرێنە وەقفی بنەماڵەی سەفەوییەت و خانەقای شێخ خواجـە عـەلیش لـەڕووی مـاددی و مەعنەوییـەوە بـووە بـەهێزترین خانـەقاو پەناگـەی هـەموو پـەناخوازێك، تەنانـەت بـۆ مەترسـیترین تاوانبارێکی هەڵهاتووی دەستی سوڵتانەکانیش[2].

## شێخ جونەید

دوای مردنی خواجە عەلی، شـێخ جونەیدی کوڕی سـەرکردایەتی تەریقەتی سەفەوییەتی گرتەدەست، سـەربووردەی ئـەم جیـاواز بـوو لەسـەربووردەی باوبـاپیرانی، چـونکە هەمیشـە هـەوڵی دەدا توانـای سیاسیی دەستبخات لەپاڵ ئەو توانا ئایینییەی کە لەخانەقاو گۆشـە بەناوبانگەکـەی باوباپیرانییـەوە دەستیخسـتبوو، باوبـاپیرانی شـێخ جونەید شـکۆو ڕێـزی پادشـاو فـەرمانڕەوایانی سـەردەمی خۆیانیـان دەستخسـتبوو، هــەرگیز پلــەو پایــەی دونیاییــان داوا نــەکردبوو، "فەزلوالله روزبهـان ئەلخەنجـی" یـەکێك لـەزانا ئێرانییـەکانی نـاکۆك بەسـەفەوییەت لەکتێبەکەیـدا لـەبارەی مێـژووی ئێرانـی ئـەو دەمـە

---

[1] – سلسة النسب الصفوية، ابدال زاهدي، برلين، ١٣٤٣هـ، ص٤٨.

[2] - تشـكيل دولـت ملـي در إيران(قيـام الدولـة القوميـة في إيـران)،والتر هيـنش: ترجمـة إلى الفارسـية: كيكاووس جهانداري، منشورات خوارزمي، طهران، ١٩٨٢م، ص٥.

مێژووییەوە ئەڵێ:"جونەید دەستبەرداری ڕێگەی باوباپیرانی خۆی بوو"[1]، مەبەستی ئەوەیە کە جونەید هەوڵی دەسکەوتی دونیایی داوەو تەماحی لەفەتحکردنی وڵاتان بووە.

شێخ جونەید لەدەستپێکردنی دەسەڵاتیدا لەگەڵ جەعفەری مامیدا ناکۆك بووە، هەردووکیان بۆ وەرگرتنی سەرکردایەتییکردنی سەفەوییەت ململانێیان بووە، بەڵام مامی بەسەریدا سەرکەوتوو بووە، بۆیە شێخ جونەید ناچار بووە ئەردەبیل بەجێبهێڵێ و کۆچ بکات بۆ ئاسیای بچووك و لەوێدا زۆرێك جوتیاری عەلەویی خۆشەویست بەمەزهەبی شیعە بناسێ کە ڕەوتێکی زیادەڕۆییان هەیە و ڕێگرییان لەناوی سێ خەلیفەکە کردووە لەناوچەکانی خۆیاندا.

ئێمەش بەڕێکیی نازانین ئاخۆ شێخ جونەید پێش کۆچکردنی بۆ ئەنادۆڵ و ئاسیای بچووك بووەتە شیعە یان دوای کۆچکردنی بۆ ئەوێ، بەڵام پیاوێکی قسە زانی ڕەوانبێژ بووەو توانیویێتیی زۆرێك جوتیاری تورك لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە بەبانگەشەکردنی سەید بوون و سیحری قسەکانی، ئەنجامی هەوڵەکەشی، دامەزراندنی سوپایەکی گەورەی پێکهاتوو بوو لەپێنج بۆ دە هەزار سەربازی تورکی ئەنادۆڵ کە موریدی بوون، دوای ئەوە شێخ جونەید لەگەڵ

---

[1] - تاریخ إیران در دوره صفویان(تاریخ إیران في العهد الصفوي)، ژمارەیەك توێژەو لێکۆڵەری زانکۆی کامبرج، وەرگێڕانی: یعقوب آجند،منشورات جامي، ٢٠٠١م، الطبعة الأولی، ص١٨.

سەربازەكانیدا پەلاماری ترابوزانی دا[١]، بەلآم لەو شەڕەدا سەركەوتوو نەبوو.

پاشان شێخ جونەید پەیوەندیی كردە پادشا(ئەوزۆن حەسەن)ەوە[٢]پادشای بنەماڵەی(ئاق قویونلو)[٣]ی توانادار، پادشا ئەوزۆن حەسەن، خەدیجە بیكمی خوشكی لەشێخ جونەید مارەكردو پاڵپشتی و هاوكاریی كرد لەگەڕانەوەی بۆ ئەردەبیل، جونەیدیش توانی مامی خۆی تێكبشكێنێ و پلەی خۆی بەدەستبخات لەسەركردایەتیكردنی تەریقەتی سەفەوییەتدا، دوای گەڕانەوەی بۆ ئەردەبیل، شێخ جونەید پەلاماری ولآتی چەركەسی دا، بەلآم لەو شەڕەدا سەركەوتوو نەبوو، لەسەردەستی پادشا شیروانشا كوژرا.

## شێخ حەیدەر

دوای كوژرانی شێخ جونەید، شێخ حەیدەری كوڕە گەورەی شێخ جونەید بوو پێگەیشت لای پادشا ئەوزۆن حەسەنی خاڵۆی و

---

[١] - شارێكی توركیایە لەسەر كەناری دەریای رەش.

[٢] - بەهێزترین و بەناوبانگترین پادشایانی ئاق قویونلو بوو توانیی شا جیهان(پادشای دەوڵەتی قەرەقویونلو) ببەزێنێ و زاڵببێ بەسەر تەبرێزو بگاتە خۆراسان و دواتریش توانی ئەبو سەعیدی پادشای ئیلیخانیی شكست پێبهێنێ و بەسەر بەغدایا زاڵبێ.

[٣] - یەكێكە لەو بنەماڵە توركانەی پێش سەفەوییەت دەسەلآتی ئێرانیان دەكرد،توانی زاڵببێ بەسەر ولآت گەلێكی بەرفراوان لەقەوقازەوە تاوەكو خۆراسان لەڕۆژهەلآت و بۆ بەغداو كەنداویش لەباشوور، ئەو بنەماڵەیە لەساڵی١٢٧٨– ١٥٠٨ز دەسەلآتی كرد، بۆ زیاتر شارەزابوون بڕوانە: (دائرة المعارف الإسلامیة الكبری)، مقالة: آق قویونلو.

پشتگیریی خاڵۆی خۆی بەدەستخست، حەیدەر بەدوای تۆڵەی کوژرانی باوکییەوە بوو، بۆیە لەڕێگەی باوکیدا بەردەوام بوو لەکۆکردنەوەی پۆست و پێگە دونیایی و روحانییەکان و یەکەمین کەسێکی بنەماڵەی سەفەوییەت بوو لەبواری سەربازی و سیاسیدا سەرکەوتن گەلێکی گەورە بەدیبهێنێ، سوپایەکی لەلایەنگرانی خۆی ئامادەساز کرد کە بەقزلباش دەناسرا[1].

بەچەك و تفاق ئامادەسازیانی کرد، شێخ حەیدەر توانی پیاوەکانی لەسەر چەك رابهێنێ و پەروەردەیەکی سەربازییانەیان بکات، ئەوەش بەیارمەتیی دۆخی رەخساوی ژێر چاودێریی ئەوزۆن حەسەنی خاڵۆی[2].

(فەزلوالله روزبهان ئەلخەنجی) لەکتێبەکەیدا باسدەکات و ئەڵێ:"شێخ حەیدەر زۆربەی کاتەکانی لەئامادەسازییکردنی چەك و

---

[1] - وشەیەکی تورکییە، واتا سەر سوورەکان و ناونانی شوێنکەوتەکانی سەفەوییەتە، چونکە بەفەرمانی مورشیدی سەفەوییان کڵاوی سووریان لەسەر دەنا، دەوترێ شێخ حەیدەر لەخەودا ئەمیری باوەڕدارانی بینیووەو پێیووتووە: بەم نزیکانە یەکێك لەنەوەی منداڵەکانت لەدایك دەبێ و رێبازی ئێمە زیندوو دەکاتەوەو بێباوەڕیی لەجیهاندا دەسڕێتەوە، بۆیە پێویستە بۆ سۆفی و شوێنکەوتەکانت تاجێك دروست بکەی.....پاشان ئیمام تاجێکی دروست کرد کە لەدوانزە پارچە پێکهاتبوو بەژمارەی دوانزە ئیمامەکە، کە شێخ لەخەو هەڵسا کڵاوی سووری قزلباشی دروستکرد بەو جۆرەی لەخەوەکەدا بینیبووی.

[2] – تشكيل دولت صفوي(قيام الدولة الصفوية)، محمد كريم يوسف جماني، منشورات اميركبير، اصفهان، الطبعة الأولى، ١٩٩٣م، ص٧٦.

تفاقـدا بەسـەر دەبـرد، وەك تـیرو رم و زۆریـش لێهـاتوو بـووە لەدروستکردنی چەکی شەڕو کەرەستەکانی بریندارکردن و کوشتن[1].

دوای ئەوەی شێخ حەیدەر سەربازانی قزلباشی ئامادەساز کرد، دەستیکردە بلاّوکردنەوەی مەزهەبی شیعەو جیهادکردنی بێباوەڕانی چەرکەس، ساڵی٨٧٤ك/ ١٤٦٩ز شەڕی دەستپێکردو ئەنجام لەسەر دەستی پادشا شیروانشا کوژرا.

## پادشا ئیسماعیلی سەفەوی

پادشـا ئیسـماعیلی سـەفەوی لەسـاڵی٨٦٦ك/ ١٤٦١ز لەشـاری ئـەردەبیل لـەدایك بـوو، منـداڵێکی شـیرەخۆر بـوو شـێخ حەیـدەری بـاوکی لەشـەڕی لەگـەڵ شروانشـا کـوژرا، ئیسـماعیل و براکـانی و دایکیشی دیل کەوتن و بەفەرمانی یەعقوب ئـاق قویونلـو لەقەلاّیـەکی نزیك شاری ئەستخری فارس بۆ چوار ساڵ و نیو بەندکران[2].

دوای مردنـی سـوڵتان یـەعقوب، هـەردوو کوڕەکـەی کـە ڕۆسـتەم مـیرزاو باینسـقر بـوون لەسـەر پادشـایەتیی نـاکۆکیی کەوتـە نێوانیانـەوە، ڕۆسـتەم ویسـتی پشـت بەسـوپای قزلباشـی سـەر بەخانەقای ئـەردەبیل ببەستێ، بۆیـە سـوڵتان عـەلیی بـرا گـەورەی

[1] - تاريخ عالم آراى اميني، فضل الله روزبهان خنجي، تصحيح وتحقيق: محمد اكبر عشيق، طهران، منشورات ميراث مكتوب، الطبعة الأولى، ص٢٣.

[2] - دايرة المعارف بزرك إسلامي(دائرة المعارف الإسلامية الكبرى)، مادة: إسماعيل أول صفوي، مهدي كيواني.

سوڵتان ئیسماعیل و تەواوی دیلەکانی تری رزگارکرد، بەلاّم لەهێزو دەسەلاّتی سوڵتان عەلیی ترسا کاتێک خەڵکی ئەردەبیل پێشوازییەکی مەزنیان لیّ کرد و بەهاوکاریی سوپاکەی، سوڵتان عەلیی توانی باینسقر تێکبشکێنیّ، بەلاّم رۆستەم میرزا لەجیاتی ئەوەی لەسەر ئەو خزمەتە پاداشتی بدات، کەچیی لەرێگەیدا لەئەردەبیلەوە بۆ تەبریز سوڵتان عەلیی کوشت، سوڵتان عەلیی ویستی لەکۆتا ساتەکانی ژیانیدا ئیسماعیل میرزای برا بچووکی بپارێزیّ، بۆیە وەسێتی بەشوێنکەوتەکانی کرد بیبەنە شوێنێکی سەلامەت، ئا بەو شێوەیە ئیسماعیل کە ئەوکات حەوت ساڵەی تەمەنی بوو لەژیاندا مایەوە[1].

میرزا بەشێوەی شاراوە بۆ ماوەیەك لەئەردەبیلدا ژیا، پاشان رۆیشت بۆ لاهیج تاوەکو لەسەلامەتیدا بژیّ، لەوێدا پاڵپشتی(کارکیا میرزا عەلی)میری لاهیج و دیلمانی شیعەی وەدەستخست، لەلاهیجاندا زمانی فارسی و عەرەبی و قورئان و بنەماکانی مەزهەبی شیعەی دوانزە ئیمامیی فێربوو لەشەمسەدین لاهیجی مامۆستایەوە، هەروەك لەحەوت گەورە سۆفییەوە فێری هونەرەکانی شەڕ بوو، کە گەیشتە

[1] - شاه إسماعیل أول، منوتشهر بارسا دولت، منشورات شرکت سهامي، الطبعة الأولی، ١٩٩٦م، ص١٢٥.

تەمەنی سیانزە ساڵان جارێکی تر گەڕایەوە ئەردەبیل و زۆرێك لەسۆفییەکان پەیوەندییان پێوەی کرد[1].

شا ئیسماعیل(١٥٠١- ١٥٢٤ز) هەر لەساڵی١٤٩٤زایینەوە سەرکردایەتیی رێکخستنەکەی بەڕێوەبردو زنجیرەیەك شەڕی بەرپا کرد، ساڵی٩٠٦ك/ ١٥٠٠ز هێرشی کردە سەر شیروان بۆ تۆڵەکردنەوەی خوێنی باوکی و جیهادکردنی خەڵکی چەرکەسی مەسیحی، سوپایەکی قزلباشی لەگەڵ بوو کە ژمارەیان حەوت هەزار سەرباز بوو، توانی فرخ یساری فەرمانڕەوای چەرکەس بەبیست هەزار سەربازەوە تێکبشکێنێ، لەساڵی٩٠٧ك/ ١٥٠١ز توانی ئەلوەند میرزا ئاق قویونلو کە شارپارێزی شیروانشا بوو لەنزیك نخجوان تێکبشکێنێ و پاشان بەسەرکەوتنەوە بڕواتە تەبرێزی پایتەختی(ئاق قویونلو)وە[2].

ئەوکات ئیسماعیل دامەزراندنی حکومەتی سەفەوییەتی راگەیاندو مەزهەبی شیعەی کردە مەزهەبی فەرمیی ولآت لەتەبرێزدا، ئەوەش بۆ یەکەمجار بوو لەمێژووی ئیسلامدا رووبدات، چونکە لەپێش سەفەوییەت لەجیهانی ئیسلامیدا شیعەگەریی مەزهەبی فەرمیی ولآت

---

[1] - دايرة المعارف بزرك إسلامي(دائرة المعارف الإسلامية الكبرى)، مادة: إسماعيل أول صفوي، مهدي كيواني.

[2] - إيران در روزكار شاه إسماعيل وشاه طهماسب صفوي(إيران في عهد شاه إسماعيل وشاه طهماسب الصفوي)، امير محمد بن خواند مير، ترجمة: غلامرضا طباطبايي مجد، طهران، مؤسسة موقوفات دكتور محمود افشار يزدي، عام١٩٨٠، تهران، ص٥٦.

نـــەبووە، ئەگەرچـــی لـــەپێش ســـەفەوییەتدا بنەماڵـــە گـــەلێکی فـــەرمانڕەوای شـــیعە مەزهـــەب یـــان لایـــەنگیری شـــیعەش بوونیـــان هەبووە.

هەڵبـــژاردنی نـــاوی ســـەفەوییەت دەگەڕێتـــەوە بـــۆ نـــاوی بـــاپیرە گەورەی ســـەفەوییەکان، کـــە شـــێخ صـــەفیەدینی ئـــەردەبیلیی بـــووەو ناونانی دەوڵەتەکە بەناوی ئەوەوە بۆ پیرۆزیی پێ وەرگرتن بوو[1].

زۆرینـــەی ئـــەوکاتی خـــەڵکی تـــەبریز شـــیعە نـــەبوون، بـــەلاَم شـــا ئیسماعیل بەیارمەتی ئەو موریدانەی کە باوەڕیان پێی هەبوو زۆریش ڕێزیان لێ دەگرت، توانی شـیعەیان بەسـەردا بسـەپێنێ و حکومەتـە شیعە مەزهەبەکەی دابمەزرێنێ، ڕۆژێکیان لەسەر مینبەری مزگـەوتی تەبریز دەوەستێ و شمشێرەکەی هەڵدەکێشێ و بانگەشە دەکات کە لەلایەن ئیمامی ساحیب زەمانەوە فەرمانی جیهادکردنی پـێ دراوە[2]، بۆیـــە ســـوونەکان لەجوڵانـــەوە بوێرانەکـــەی ترســـان و ملکەچـــی فەرمانـــەکانی بـــوون، ئـــەویش فـــەرمانی بەوتاربێـــژو بانگبێـــژەکان دا شـــایەتومانی سێیەم بخـوێنن(أشـهد أن عليـاً ولـي الله) و خوێنـدنی دەستەواژەی(حي على خير العمل)لەبانگدانـدا، هـەروەك فـەرمانی دا

[1] - إيران در روزكار شاه إسماعيل وشاه طهماسب صفوي(إيران في عهد شاه إسماعيـل وشـاه طهماسـب الصفوي)، امير محمد بن خواند مير، ترجمة: غلامرضا طباطبايي مجد، طهران، مؤسسة موقوفات دكتـور محمود افشار يزدي، عام ١٩٨٠، تهران، ص١٢٦.

[2] - الصلة بين التشيع والتصوف، كامل مصطفى الشيبي، طهران، منشـورات امير كـبير، عـام ١٣٥٩، ص٣٨٨.

قوتابخانه بۆ مەزهەبی شیعه دروستبکرێ و لەنێو خەڵکدا شیعه بڵاوبکرێتەوە، بەڵام مەیلی شیعەگەریی لەتەواوی ئێراندا ڕێگەی بۆ سازدرا بوو، نارەحەتیی گەلێکی گەورەی ڕووبەڕوونەبوویەوە لەکردنی شیعه بەمەزهەبی فەرمیی وڵات، ئا بەو شێوەیە دەوڵەتی سەفەوییەت دامەزرا، یەکەمین دەوڵەتێکی ئێرانیی سەربەخۆ دوای هەشسەد ساڵ لەهاتنی ئیسلام بۆ ئەو وڵاتە لەساڵی٣٢ك/ ٦٥٢ز و ئیتر سەربەخۆیانە فەرمانڕەوایی کرد[١].

لەکۆتاییەکانی سەدەی پانزە(١٤٩٤ن) دەوڵەتی سەفەوییەت دامەزراو بۆ زیاتر لەدوو سەدە بەردەوام بوو، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەکۆی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە، لەماوەیەکی کەمدا شا ئیسماعیلی سەفەوی(ك١٥٢٤ن) توانیی ئێران و ناوچە گەلێکی زۆری عێراق داگیر بکات، دوای تەبریز گەیلانی داگیرکرد کە یەکێکە لەپارێزگاکانی باکووری ئێران لەسەر کەناری دەریای قەزوین، پاشان لەساڵانی١٤٩٩- ١٥٠١ز فراوانخوازییەکانی بەردەوامیی پێدا تاوەکو تەواوی وڵاتی فارس(ئێران)ی گرتەوەو ساڵی١٥٠٧ز قەرەقویونلوی دەرپەڕاندو عێراقی داگیر کرد.

شەڕی شا ئیسماعیلی سەفەویی بەدوای یەکدا هات،لەلایەکەوە لەگەڵ عوسمانییەکان لەسنوورەکانی ڕۆژئاوای وڵات و لەگەڵ

[١] - دائرة المعارف الإسلامية الشيعية، سيد حسن الأمين، مادة الصفوية، دار التعارف، بيروت، ١٩٩٧.

ئۆزبەکییەکانیش(شەیبانییەکانی بوخارا) لەسەر سنوورەکانی ڕۆژهەلأت لەلایەکی ترەوە.

پادشای گەنج توانی لەبەرەی ڕۆژهەلأت ئۆزبەکەکان تێکبشکێنێ و ساڵی١٥١٠ز پادشاکەیان بکوژێ کە میر موحەممەدی شەیبانیی بوو، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا لەبەرەی ڕۆژئاوادا دەسکەوتی نەبوو، شەڕە داگیرکارییەکانی لەجەنگی چاڵدێران لەبەرانبەر عوسمانییەکان وەستا، ئەو عوسمانیانەی بەو سەرکردە گەنجە ترسیان لێ نیشتبوو، بۆیە پەنایان بردەبەر چەکی ئاگرین، لەوانە بەکارهێنانی تۆپ بوو، بەوەش سوپای ئیسماعیلیان دۆڕاند کە بەشمشێرو چەکی سەرەتایی شەڕیان دەکرد[1].

شا ئیسماعیل لەو شەڕەدا زۆربەی سەربازەکانی زیان کردو ژنەکەشی کەوتە دەست عوسمانییەکان و بۆی نەیانگێڕایەوە، خەلیفەی عوسمانیی کردیە دیاریی بۆ یەکێك لەگەورە ئەفسەرانی سوپاکەی، بۆیە پادشای سەفەوی لەداخا گیرۆدەی عەرەقخواردنەوە هات و بەدەردی ئەو دۆڕانەوە دەینالأند تاوەکو لەساڵی١٥٢٤ز بەنەخۆشیی سیل لەتەمەنی سی و حەوت ساڵیدا مردو لەئازەربێجان نێژرا[2].

---

[1] - الصلة بين التشيع والتصوف، كامل مصطفى الشيبي، طهران، منشورات امير كبير، عام ١٣٥٩، ص٢٦٦- ٢٦٧.

[2] - انقلاب الإسلام بين الخواص و العوام، محمد عارف اسپناقچي پاشازاده، منشورات دليل، قم، الطبعة الأولى، ص١١٢.

هەندێ مێژوونووسی سەردەمی سەفەوی، نمونەی ئەمینی و خواندمیر، وەهای باوەڕ ئەکەن کە شا ئیسماعیل خاوەن سیفەت گەلێکی سەرکردەیی بووە لەنمونەی ژیری و خۆڕاگری و ئازایەتی و توانای کۆکردنەوەی جەماوەرو کاریگەریی کردنەسەریان و جولآنەوەو ئاراستەکردنیشیان، هەروەك شوێنکەوتەکانیشی بەپادشایەکی دادپەروەر دایاننـاوەو باسیان کردووە کە شیعەی پوخت و دڵسۆز بووە لەباوەڕی خۆیداو، ئەڵێن کە لەپێناو ماف و زیندووکردنەوەی شەریعەت و جێبەجێکردنی دادپەروەری و سەرکوتکردنی ستەم و زۆرداریی لەئێراندا راپەڕیووە، پیاوێك بووە شیعرو شاعیرو ئەدیبانی خۆشوویستووە، بەتورکی و فارسی و عەرەبیی شیعری خوێندووەتەوە، دیوانە شیعرێکیشی هەیە تیایدا ستایشی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و دوانزە ئیمامەکەی کردووە[1]، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا ئیسماعیل شا وەك پادشا هاوشێوەکانی تری بەدەمارگیری و زۆرداری و ئەو خراپەبیانەی دەمێنێتەوە کە لەسرووشتی دەسەلآتەوە سەرچاوە دەگرن، گرنگترین رەخنەیەکیش لەدژی زۆر سەخت و دڵڕەقبوونی بووە لەگەڵ ناحەزەکانی و حەزی تۆڵەکردنەوەی لێیان.

---

[1] – فتوحات اميني، امير صدر الدين ابراهيم اميني، مركز الوثائق للمكتبة المركزية في جامعة طهران: النسخة الخطية، رقم٥٧٥٠، الورقة رقم١٧٠.

دوای ئیسماعیل، سیانزە پادشا فەرمانڕەواییان کرد تاوەکو بنەماڵەکە نەما، ئەمەی خوارەوەش خشتەی ناوی ئەو پادشایانەو ساڵی فەرمانڕەواییانە:

| فەرمانڕەوا سەفەوییەکان | ماوەی فەرمانڕەواییان | | ژیانیان | |
|---|---|---|---|---|
| ئیسماعیلی یەکەم کوڕی حەیدەر | ١٥٠١ | ١٥٢٤ | ١٤٨٧ | ١٥٢٤ |
| تەهماسبی یەکەم کوڕی ئیسماعیل | ١٥٢٤ | ١٥٧٦ | ١٥١٤ | ١٥٧٦ |
| ئیسماعیلی دووەم کوڕی تەهماسب | ١٥٧٦ | ١٥٧٨ | | |
| موحەممەد خودا بەندەی کوڕی تەهماسب | ١٥٧٨ | ١٥٨٧ | | |
| عەباسی یەکەم کوڕی موحەممەد خودا بەندە | ١٥٨٧ | ١٦٢٩ | | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| صەفیی یەکەم کوڕی صەفی میرزا | ١٦٢٩ | ١٦٤٢ | | |
| عەباسی دووەم کوڕی صەفیی یەکەم | ١٦٤٢ | ١٦٦٦ | | |
| صەفیی دووەم کوڕی عەباسی دووەم(لە١٦٦٨ی زایینەوە بەناوی سلێمانەوە فەرمانڕەوایی کرد) | ١٦٦٦ | ١٦٩٤ | | |
| حوسێنی یەکەم کوڕی سلێمانی یەکەم | ١٦٩٤ | ١٧٢٢ | ١٦٦٨ | ١٧٢٦ |
| تەهماسبی دووەم کوڕی حوسێنی یەکەم | ١٧٢٢ | ١٧٣٢ | ١٧٠٤ | ١٧٤٠ |
| عەباسی سێیەم کوڕی تەهماسبی دووەم | ١٧٣٢ | ١٧٣٦ | ١٧٣٢ | ١٧٤٠ |

| سلێمانی دووەم کوڕەزای سلێمانی یەکەم | ١٧٤٩ | ١٧٥٠ | ١٧١٤ | ١٧٦٣ |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ئیسماعیلی سێیەم کوڕی مورتەزا | ١٧٥٠ | ١٧٧٣ | ١٧٣٣ | ١٧٧٣ |

### پادشا تەهماسبی یەکەمی کوڕی ئیسماعیل

دوای مردنی باوکی، لەتەمەنی یانزە ساڵیدا گەیشتە دەسەڵات و دەسەلأت لەلایەن میرەکانی قزلباش بەڕێوەدەبرا، ناکۆکیی لەنێوان میرەکاندا دەرکەوت و بەو هۆیەوە دەوڵەتی تازە لاو لاواز کەوت و دوژمنانی کێبرکێکار بۆ دەسکەوتنی فتوحات تەماحیان کردە دەوڵەتی سەفەوی، عوبەیدوالڵە خانی ئۆزبەك هێرات و ناوچە گەلێکی لەخۆراسان داگیرکرد، سولەیمانی قانونیی سوڵتانی عوسمانیش عێراق و بەشێکی ئازەربێجانی داگیرکرد، هەروەها لەناوچە جیاوازەکانی ولأتدا کۆمەڵێ هەلگەڕانەوە دەرکەوتن، لەخۆراسان و بەغداو تەبریزو شوێنانی تر، بەلأم تەهماسب توانیی خێرا هێزی خۆی وەربگرێتەوەو بەسەر ناوچە دابڕێندراوەکاندا زاڵبێتەوە، بەوەش هاوسەنگیی گەڕایەوە حاڵی جارانی سەردەمی کۆتایی ژیانی پادشا ئیسماعیل، بۆ خۆ بەدوورگرتن لەپەلامارە

عوسمانییەکانیش پایتەختی لەتەبریزەوە گواستەوە قەزوین و تەهماسب لەڕێگەی سیاسەتی هاوسەنگ و یەکلاکردنەوەی کێشە ئایینییەکانەوە، توانیی دوژمنەکانی بێ لایەن بکات.

ماوەی تەهماسب سەقامگیرییەکی ڕێژەییانەی هەبوو، لەفتوحاتەکاندا بەردەوام نەبوو، ئەگەرچی دەیتوانی پارێزگاریی ئەو شوێنانە بکات کە شا ئیسماعیلی باوکی فەتحی کردبوو، هەروەها لەسەردەمی خۆیدا هانی جموجوولی وێژەو هونەرەکانی دا[1].

## پادشا ئیسماعیلی دووەمی کوڕی تەهماسب

ئیسماعیل بۆ ماوەی بیست ساڵ لەتەمەنی باوکیدا بەند بوو بەهۆی هەندێ هەڵسوکەوتی پێچەوانەیەوە تاوەکو تەهماسبی باوکی مرد، چاوەڕوانکراو بوو کە حەیدەری برای بچێتە دەسەلات، بەلام میرە قزلباشەکان بوونە دوو بەشەوەو هەریەکەو پشتگیریی یەکێك لەو دوو برایەیان دەکرد و بەوە گەیشت لایەنگرانی ئیسماعیل زاڵبن، حەیدەر کوژراو ئیسماعیل لەبەندیخانە ئازادکراو راستەوخۆ چوو بۆ کۆشك.

ئیسماعیلی دووەم توندو رەق بوو لەمامەڵەکردنی خەڵکدا، بۆیە خێرا دەستی کردە کوشتنی براو هەندێ کەسوکاری خۆی لەبنەماڵەی سەفەوی و پاکتاوی زۆری کرد لەڕیزی بنەماڵەی

---

[1] - تاریخ فرهنك وتمدن ایران در دوره صفوي(التاريخ الثقافي والحضاري لإيران في العهد الصفوي)، عباس قدياني،منشورات فرهنك مكتوب، طهران: الطبعة الرابعة، ٢٠٠٠م، ص٥٠، ٥٩.

فەرمانڕەوا و میرە قزلباشەکان، بۆیە هەندێ لەبنەماڵەی فەرمانڕەوا لەدژی کۆبوونەوەو ژەهر خواردیان کردو کوشتیان، وتراوە بەهۆی زیادەڕۆیی کردنی لەبەکارهێنانی تلیاکەوە مردووە.

ئیسماعیلی دووەم تەنیا ساڵێك و چەند مانگێك فەرمانڕەوایی کرد، بەرانبەر شوێنکەوتەی مەزهەبە سوونننییەکان لێبووردە بوو، هەوڵیدا هەندێ چاکسازیی ئایینیی بخاتە دەسەلآتەوە، گرنگترین ئەو چاکسازییانەش رێگریکردن بوو لەنەفرەتکردنی خەلیفەکان، بۆیە بەحەزو شوێنکەوتەیی مەزهەبی سووننە و پابەندنەبوونی تەواو بەبنەماکانی شیعەگەرییەوە تۆمەتبار کراوە[1].

## پادشا موحەممەد خودا بەندەی کوڕی تەهماسب

ئیسماعیلی دووەم فەرمانی دا موحەممەد برای بکوژرێت کە فەرمانڕەوای ویلایەتی شیراز بوو، بەلآم لەساتەکانی کۆتاییدا پێش جێبەجێکردنی بڕیارەکە، هەواڵی مردنی پادشا ئیسماعیلی برای بلآوبوویەوەو ئەوکات جگە موحەممەد هیچ میرێکی زیندووی بنەماڵەی سەفەوییەت بوونی نەبوو، بۆیە لەکوشتن رزگاری بوو کرایە سوڵتانی ولآت و خۆی نازناو کرد بەخودا بەندە، واتا(عبدالله — بەندەی خوا)، وەك رێز و پێزانینێك لەڕزگاربوونی لەکوژران و بوونە پادشا.

---

[1] - دايرة المعارف بزرك إسلامي(دائرة المعارف الإسلامية الكبرى)، مادة: إسماعيل أول صفوي.

موحەممەد پیاوێکی لاواز بوو، زۆرێك نەخۆشیی لەخۆیدا هەلگرتبوو، نەیدەتوانی جڵەوی کاروبارەکان بەڕێوە ببات، بۆیە ململانێ و ناکۆکی گەلێکی توند لەنێو میرە قزلباشەکان دەرکەوت، هەرلایەك و پشتگیری کوڕێکی موحەممەدیان ئەکرد، لەهەمان کاتدا دوو دوژمنە سەرسەختەکەش، ئۆزبەك و عوسمانییەکانیش شەڕێکی نوێیان کردە سەر ئێران.

پادشا موحەممەد خودابەندە بێتوانابوو لەوەی کێشەکان چارەسەر بکات و بەسەر دۆخەکاندا زاڵبێ و بەرپەرچی هێرشی دەرەکیی بێتەوە، ئەگەرچی لەسەر دەستی حەمزە میرزای کوڕی دژ بەعوسمانییەکان لەبەرەی رۆژئاوا هەندێ سەرکەوتن هاتەدی.

کوڕەکەی دیکەی کە عەباس میرزا بوو بەپشتگیریی ژمارەیەك میری قزلباش خۆی وەك پادشا راگەیاندو لەخۆراسان کە خۆی فەرمانڕەوای بوو رۆیشت بۆ قەزوینی پایتەختی ئەوکاتی سەفەوییەکان، پادشا خودا بەندە لەشیراز بوو هەواڵی بەپادشا بوونی کوڕەکەی بیستەوە، بەرپەرچی بڕیاری کوڕەکەی نەدایەوەو دەست لەکارکێشانەوەی خۆی راگەیاندو لەبەردەم میری سەربازان و فەرماندەی سوپاو وەزیرەکان تاجی خستەسەر کوڕەکەی[1].

---

[1] - تاریخ فرهنك وتمدن ایران در دوره صفوي(التاریخ الثقافي والحضاري لإیران في العهد الصفوي)، عباس قدیاني،منشورات فرهنك مكتوب، طهران، الطبعة الرابعة، ٢٠٠٠م، ص٦١، ٦٤.

## پادشای عەباسی یەکەمی کوڕی موحەممەد خودا بەندە

عەباس میرزا لەتەمەنی هەژدەساڵیدا خۆی بەسوڵتانی وڵاتی سەفەوییەت ڕاگەیاند،لەسەرەتای دەسەڵاتەکەیدا پادشای گەنج ڕووبەڕووی سەختیی گەلێکی زۆر بوویەوە، ئۆزبەك و عوسمانییەکان پەلاماری ئێرانیان دابوو، چەند شارو ناوچەیەکی زۆریان لێ داگیرکردبوو، لەهەمان کاتدا هەندێ ویلایەتی نێوخۆی ئێرانیش سەربەخۆییان ڕاگەیاندو ڕەتیان کردەوە ملکەچی دەسەڵاتی سەفەوییەت ببن، بۆیە شا عەباس ناچار بوو لەگەڵ عوسمانییەکاندا ئاشتەوایی بکات و لەبەرانبەر ئەو ئاشتییەدا تەبرێزو کرجستان و ناوچەگەلێکی بەرفراوانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران بداتە عوسمانییەکان.

پاشان دەستی کردە سەرکوتکردنی هەڵگەڕانەوەکانی یەزدو کرمان و گەیلان و شوێنانی تر و فەرمانڕەوا هەڵگەڕانەوەکانی ناچار بەملکەچیی کرد، دواتر ڕۆیشت بۆ شەڕکردنی ئۆزبەکەکان کە دەستیان گرتبووەسەر مەشهەدو شار گەلێکی تری خۆراسان و شتە گرانبەهاکانی مەرقەد ئیمام ڕەزایان بەتاڵانیی بردبوو، کنێبەکانیشیان سووتاندبوو، خەڵکێکی زۆریشیان کوشتبوو.

شا عەباس توانی لەخاکەکانی ئێراندا ئۆزبەك بدۆڕێنێ و بۆ ماوەیەکی زۆر شەڕیان دوور بخاتەوە، دوای ئەوەش

بەسەرکردایەتی(اللە ویردی خان) سوپاکەی بۆ باشووری ئێران ئاراستە بکات کە پورتوگالەکان بۆ نزیکەی سەدەیەك دەستیان بەسەر شارەکانی ئەوێ و دوورگەکانی کەنداو گرتبوو، توانیی ناوچە داگیرکراوەکان ئازاد بکات و دەستی گرت بەسەر بەندەری کمبرون کە دواتر بەناوی ئەوەوە ناسرا بەبەندەر عەباس و بەسەر دوورگەی هورمسوزو بەحرەین و عومانیشدا زاڵبوو، پاشان روویکردە عوسمانییەکان، دوای شەڕ گەلێکی زۆرو تاڵ توانیی هەموو ئەو ناوچانە بگێڕێتەوە کە کردبوویە دیاریی عوسمانییەکان، نەك هەر ئەوە، بەڵکو عێراقیشی وەرگرتەوە کە لەکۆتایی فەرمانڕەوای تەهماسبدا عوسمانییەکان بەسەریدا زاڵهاتبوون[1].

ماوەی فەرمانڕەوایی شا عەباس، بەماوەی زیووینی قۆناغی سەفەوییەت دادەنرێت، چونکە دوای ئاژاوەو پەشێوی گەلێك، لەسەردەمی ئەودا دۆخی دەوڵەت سەقامگیر هات و بەحرەین"تەواوی کەناری رۆژهەلاتی کەنداوی عەرەب" چووە پاڵ ئێران لەساڵی١٦٠١زاییداو ساڵی١٦٠٢ز ئازەربیێجانی داگیرکردو پاشان شیرازو ئەرمینیاو بەش گەلێکی ئەفغانستان لەساڵی١٦٠٨زو ساڵی٢٣/ ١٦٢٤ز بۆ جارێکی تر عێراق و کوردستانیشی خستە پاڵ دەسەلاتەکەی.

---

[1] - تاريخ فرهنك وتمدن ايران در دوره صفوي(التاريخ الثقافي والحضاري لإيران في العهد الصفوي)، عباس قدياني،منشورات فرهنك مكتوب، طهران، الطبعة الرابعة، ٢٠٠٠م، ص٦٥– ٧٣.

لەئاستی نێوخۆییشدا، شا عەباس توانی دەسکەوت گەلێکی زۆری هەبێ، چاکسازیی گشتگیری لەسوپادا کردو پشتی بەستە هەندێ کۆیلەی مەسیحیی بۆ سەرکردایەتیکردنی ئەو سوپایەو هەندێ دەوڵەتی ئەورووپیش تاوەکو بەچەکی نوێی ئاگرین سوپاکەی ئامادە بکەن، یەکەمین کەشتییەکی دەریایی لەکەنداودا دامەزراندو لەرێگەی زاڵبوونی بەسەر کەنداوی فارسدا توانی بازرگانیی رێکبخات، بەوەش ئابووریی وڵات بووژایەوەو شا عەباس شاری ئەسفەهانی ئاوەدان کردەوەو لەقەزوینەوە پایتەختی گواستەوە ئەسفەهان و ئەو شارەی کردە گرنگترین شارەکانی جیهانی ئەوکات، هەروەها لەسەردەمی ئەودا بڕیاری زۆرێك مەراسیمی تایبەت بەکۆشك و ئەرکی دارودەستە درا بەرانبەر بەشا.

دوای مردنی شا عەباس، فەرمانڕەوا گەلێك هاتن بەزۆریی کەسێتییەکی لاوازیان هەبوو، نەیاتوانی دەسکەوتەکانی بپارێزن، نەك هەر ئەوەش بەڵکو بەلەسەرخۆیی زۆربەیان لەنێو برد[1].

### پادشا صەفیی یەکەم کوڕی صەفی میرزا

شا چوار کوڕی هەبوو، صەفی میرزا کە بەفرمانی باوکی کوژرا، تەهماسب میرزا کە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی باوکیدا مرد، موحەممەد میرزاو ئیمام قلی، بەفەرمانی پادشای باوك چاوی

---

[1] - صفویة از ظهور تا زوال(الصفویة من الظهور إلى الزوال)، رسول جعفریان،منشورات: مؤسسة فرهنكي دانش واندیشه معاصر، طهران: الطبعة الأولى،١٩٩٩م.

هەموویان هەڵکۆڵراو لەپێش مردنیشی شا عەباس وەسێتی کرد سام میرزای کوڕی صەفی میرزا جێگەی بگرێتەوە، بۆیە لەتەمەنی حەڤدە ساڵیدا پادشای لاو لەسەر تەختی پادشایی دانیشت و وەك زیندوو ڕاگرتنی ناوی باوکی کۆچکردووی نازناوی شا صەفیی لەخۆینا، شا صەفی کەسێکی لاواز بوو، بێ ئەزموون و لەوەدا نەبوو جڵەوی دەسەڵات بگرێتەدەست، بۆیە ئێران لەسەردەمی ئەودا پەشێوی گەلێکی بەخۆوە بینی و پادشای گەنجیش لەماوەی دەسەڵاتەکەیدا سەرقاڵی بەرپەرچدانەوەی هەڵمەتەکانی ئۆزبەك و عوسمانییەکان بوو.

لەساڵی١٠٥٢ك/ ١٦٤٢ز لەتەمەنی سی و یەك ساڵیدا پادشا مردو سیانزە ساڵ فەرمانڕەوایی کردو لەشاری قومدا مرد[١].

## پادشا عەباسی دووەمی کوڕی صەفیی یەکەم

لەتەمەنی دە ساڵیدا گەیشتە دەسەڵات، بۆیە میرەکان و پیاوانی دەسەڵات کاروبارەکانیان گرتەدەست، ماوەی فەرمانڕەواییەکەی ئارامییەکی ڕێژەییانەو خۆشگوزەرانییەکی گشتیی لەوڵاتدا هەبوو، بۆ یەکەمجار بوو پەیوەندییەکانی سەفەوییەت و ئۆزبەك باش بێ و لەخاکی ئێراندا پادشای سەفەوی میوانداریی دوو پادشای ئۆزبەکی کردو یارمەتیی یەکێکیانی دا بۆ بەرپەچدانەوەی پادشا کورکانیی

---

[١] - تاریخ فرهنك وتمدن ایران در دوره صفوي(التاريخ الثقافي والحضاري لإيران في العهد الصفوي)، عباس قدياني،منشورات فرهنك مكتوب، طهران، الطبعة الرابعة، ٢٠٠٠م، ص٧٤.

هیندی کە هێرشی کردبووە سەر خاکی ئۆزبەك، ساڵی١٦٤٨ز هەندێ بەشی نوێی ئەفغانستانی خستەسەر دەوڵەتەکەی.

لەسەردەمی عەباسی دووەمدا، دەوڵەتی سەفەوییەت کۆتا شکۆو سەربەرزیی خۆی ژیا، ئاڵوگۆڕی بازرگانیی زۆری لەگەڵ دەوڵەتانی ئەورووپادا ئەنجامدا لەڕێگەی ئەو کۆمپانیایانەی لەناوچەکەدا کاریان دەکردو هەندێ چاکسازیی ناوخۆییشی ئەنجامدا[1].

## پادشا صەفیی دووەمی کوڕی عەباسی دووەم

دوای مردنی باوکی چووەسەر تەختی دەسەلاّت، دوای ماوەیەك لەفەرمانڕەوایی ناوی خۆی گۆڕی بۆ شا سلێمان، ئەوەش بەئامۆژگاریی هەندێ ئەستێرەگرەوەی کە بەپێی بیروباوەڕی خۆیان لەخراپی دۆخی گەردوونیی وریاییان پێ دابوو.

پادشا دوور بوو لەسیاسەت و هیچ شتێکی لەبارەی فەرمانڕەواییەوە نەدەزانی، بەلاّم شانسدار بوو کە وەزیر گەلێکی لێهاتووی هەبوو، هەروەها وڵاتانی هاوسێش لەحاڵەتی لاوازی و سەرقاڵیدا بوون بەیەکلاکردنەوەی کاروباری نێوخۆیی خۆیانەوە، یان سەرقاڵی بەرپەرچدانەوەی هەڵمەتە دەرەکییەکانی لایەنەکانی تر

[1] - تاريخ فرهنك وتمدن ايران در دوره صفوي(التاريخ الثقافي والحضاري لإيران في العهد الصفوي)، عباس قدياني،منشورات فرهنك مكتوب، طهران، الطبعة الرابعة، ٢٠٠٠م، ص٧٤- ٧٧.

بوون، بۆیە لەماوەی فەرمانڕەوایی ئەودا هیچ نشوستییەك رووی نەدا.

ولآت لەو ماوەیەدا بەشێوەیەکی تێبینیکراو باشکردنی پەیوەندییە ئابووری و بازرگانییەکانی بەخۆوە بینی لەنێوان ئێران و دەوڵەتانی ئەورووپاو هەندێ گەڕیدەی رۆژئاوایی سەردانی ئێرانیان کرد، دیارترینیان(شاردن)ی فەرەنسی و (تاورنیە) بوون و گەشتەکەی ئەوان بەگرنگترین سەرچاوە مێژوویییەکانی لێکۆڵینەوەی ماوەی سەفەوییەت دادەنرێت، هەروەك لەو ماوەیەدا ئەسفەهان ئاوەدانکردنەوەیەکی چڕی بەخۆوە بینی و تەلار گەلێکی شوێنەوارییشی تێدا دروستکرا، گرنگترین ئەو تەلارانە، تەلاری(هشت بهشت) بوو، واتا: هەشت بەهەشت[1].

## پادشا حوسێنی یەکەمی کوڕی سلێمان

ماوەی فەرمانڕەوایی شا حوسێن، لەمێژووی سەفەوییدا بەقۆناغی هەرەس دادەنرێت، پادشا دەروون لاوازو نەزان بوو بەسیاسەت و بەڕێوەبردنی کاروبارەکان و بووە گەمەی دەست میرو وەزیرەکان، لەڕۆژگاری ئەودا ئابووریی ولآت خێرا وێران بوو، بەهۆی خراپ رێوشوێنگرتنییەوە برسێتییەکی گشتیی ولآتی گرتەوە،

---

[1] - تاريخ فرهنك وتمدن ايران در دوره صفوي(التاريخ الثقافي والحضاري لإيران في العهد الصفوي)، عباس قدياني،منشورات فرهنك مكتوب، طهران، الطبعة الرابعة، ٢٠٠٠م، ص٧٧- ٨٠.

یەکـــەمین برســـێتی لەســـاڵی۱۱۱۹ك/ ۱۷۰۷ز بـــوو، دووەمـــیش لەســـاڵی۱۱۳۰ك/ ۱۷۱۷ز بـوو، کۆتـایی و سەختەکەشـی لەهـەردوو ســـاڵی۱۱۳٤و ۱۱۳۵ك/ ۱۷۲۱و ۱۷۲۲ز بـوو بـەهۆی گـەمارۆدانی ئەفغانەکانـەوە بـوو کـە بەنـەمانی دەسـەڵاتی سـەفەوی و زاڵبـوون بەسەر خەڵکە هەژارەکەدا کۆتاییهات[1].

مێژوو بۆمـان دەگوازێتـەوە، کـە خـەڵك لەئەسفەهانی پایتـەختی دەوڵـەتی سـەفەوییەتدا ناچـاربوون سـەگ و پشـیلەو مشـك بخـۆن، تنانەت پاشەڕۆی ئاژەڵ و مرۆڤی مردووش بخۆن، منداڵیان دەدزی و دەیانخواردو ئەو گۆشتانەش کە لەدوکانەکانـدا دەفرۆشـران گۆشـتی مرۆڤ بوون[2].

هـەروەك حوسـێنی یەکـەم بـووە هـۆی تـووڕەکردنی تایەفـەی ســـوننە، کاتێـــك لێبـــووردنی دەرنەخســـت لەمامەڵەکردنیانـــداو دەمـــــارگیریی توونــــدی هــــەبوو بـــۆ مەزهـــــەبی شــــیعە، لەسـاڵی۱۷۱۹زاییـنـەوە ئەفغانـە سـوونەکان کـە لـەژێر دەسـەڵاتی دەوڵـەتی سـەفەویدا دەژیـان رووەو ئەسـفەهان پـەلاماریان بـردو میرویـس کــە یــەکێك بـوو لەســەرکردە ئەفغانـەکان دەسـتیکردە کۆکردنەوەی فەتوای رێگەدان بەهاونیشتیمانە سوننەکان لەڕاپەڕین

---

[1] – احمد کتابي، بجوهشي در زمینه جمعیت شناسي تـاریخي إیـران، فصـلیة جمعیـت، العـدد۲۵و ۲٦، ص۳٤ – ۵۸.

[2] - علل سقوط شاه سلطان حسین(أسباب سقوط الشاه حسین)، دوسرسو، الترجمة إلی الفارسـیة، ولـي الله شادان، منشورات کتابسرا، الطبعة الأولی، ۱۹۸۵م، ص۱۲– ۲۳.

دژ بەدەسەلاّتی شیعەو توانیی ئەفغانە سوونئە مەزھەبەکان یەکبخات، دوای ماوەیەك و لەسەردەمی مەحمودی کوڕیدا، لەساڵی١٧٢٢ز ئەفغانەکان ئەسفەھانیان داگیرکردو شا حوسێنیان لەسەرکارلابرد کە بەخۆی تاجەکەی پێشکەشیان کردو لەدەسەلاّت لاچوو، پاشان ساڵی١٧٢٦ز لەسێدارەیان دا.

## هەرەسهێنان و کۆتاییهاتنی دەوڵەتی سەفەوییەت

شا عەباس ئێرانی پاڵدا رووەو پێشکەوتن، بەلاّم لەھەمانکاتدا تۆوی لاوازیشی تێدا چاند، چونکە ھەر لەرۆژگاری عەباسی گەورەوە لەنێو بنەماڵەی سەفەوییەتدا لەترسی پۆست و پایە یەکتر کوشتن بلاّوبوویەوە، لەکام لەنزیکانی خۆیان بترسابایەن دەیانکوشت، تەنانەت کوڕانی کۆشکی خۆیشیان دەکوشت، ھەروەك خودی شا عەباسی گەورە ئەوەی ئەنجامدا، چاوی چوار کوڕەکەی خۆی ھەڵکۆڵی و پاشان کوشتیانی.

ھەروەھا زۆریی دوژمنایەتیکردنی ھاوسێ موسڵمانەکانیش ھۆکارێکی بەھێزی ماندووکردن و لاوازخستنی دەوڵەتەکە بوو، لەمیانەی شەڕەکانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و ئۆزبەك و کوردو ئەفغانەکان ھەوڵی یەکخستنی موسڵمانانی نەدا لەژێر یەك ئالاّداو خیلافەتێکی ئیسلامیی دانەمەزراند، بەڵکو ئامانجی زاڵبوون و پەلکێشانی دەسەلاّت و کوشتنی بەرھەڵستکاران بوو، شەڕەکان

لەگەڵ دەوڵەت و خەڵكانی هاوسێدا بەردەوام بوو، ئەوەش بووە هۆكاری لاوازخستنی دەوڵەتی سەفەوییەت و پاشان ڕووخانی.

ئەو زۆردارییەی كە دژ بەگەل مومارەسە دەكراو باجی گومرگەكان و ستەمكردن لەكرێكاران، شۆڕشە نێوخۆییەكانی خستەوە، هەروەها ئەو لاوازییە ئابوورییەی كە لەسەردەمی شا عەباسدا ئازاری بەئێران چەشت لەئەنجامی ئەو سیستەمە دەرەبەگایەتییەی ئەو هێنایەبوون و بووە هۆكاری برسێتی و كەمیی خواردن و سەربازەكانیش مووچەی خۆیانیان وەرنەدەگرت[1].

بەهۆی دەركەوتنی ململانێ گەلێكی قووڵ لەگەڵ عوسمانییەكاندا، ئەفغانەكانیش نەیانتوانی دەسەلاتی خۆیان بەسەر ئێراندا قایم بكەن، شەڕێكی سەخت لەنێوان ئەفغان و عوسمانییەكان سەری هەڵدا، هەروەها لەئێراندا كۆمەڵێ هەلگەڕانەوە ڕوویانداو داوای گەڕاندنەوەی دەسەلاتی سەفەوی و دەركردنی ئەفغانەكان دەكرا لەئێراندا، لەتەواوی ئێراندا پەشێویی باو بوو، تاوەكو سەركردەیەكی بەرزخواز بەناوی(نادر ئەفشار) بەنوێنەرایەتیی تەهماسبی كوڕی شا حوسێنی سەفەویی توانی سەركردایەتی سوپایەكی گەورەی ئێرانییەكان بكات و پاشماوەی ئەفغانەكان

---

[1] - الحروب العثمانية الفارسية وأثرها في انحسار المد الإسلامي عن أوروبا، محمد عبداللطيف هريدي، ط۱، القاهرة: دار الصحوة للنشر والتوزيع، ص٩٤.

لەئێران وەدەربنێ و ناوچەیەکی بەرفراوانی ئەفغانستان و هیندو ناوچەگەلێکی تری دەوڵەتی عوسمانییش داگیر بکات[1].

دەرکەوتنی ململانێ و ناکۆکیی نێوان نادرو تەهماسبی سەفەوی بووە هۆی لابردنی تەهماسب و، عەباسی دووەمی شیرەخۆری کوڕی تەهماسب بەپادشایەکی نوێ دیاری کرا، دوای ماوەیەکی کورتی لەسەرکارلادانی تەهماسب و دیاریکردنی کوڕە شیرەخۆرەکەی لەجێگەی تەهماسبی باوکی و خۆیشی بەسەرپەرشتیاری کوڕەکە دیاریی کرد، سەرکردەو پیاو ماقووڵەکانی لەیەك شوێندا کۆکردەوەو لێیانی پرسی: بۆ فەرمانڕەوایی کێ هەڵدەبژێرن؟ ئەوانیش کۆدەنگییان لەسەر هەڵبژاردنی ئەو بوو(نادر)، دەیانزانیی بۆ ئەوە پێداگرە، بۆیە شا عەباسی شیرەخۆریش لەسەرکارلادرا، ئەوەش کۆتایی دەوڵەتی سەفەوییەت بوو، منداڵە شیرەخۆرەکەش وەك باوکی کوژرا لەساڵی١١٥٣ك/ ١٧٤٠ز.

لەکۆتاییدا نادر شا کۆتایی ماوەی سەفەوییەتی راگەیاندو خۆی بەشایەکی نوێ بۆ ئێران راگەیاند بەناوی بنەماڵەی ئەفشارییەوە، بەڵام خراپ مامەڵەکردنی ئەفسەرو میرەکانی سوپاو وەزیرەکانی لەکۆتایی تەمەنیدا، بوویە هۆکاری هەڵگەڕانەوەیان لەدژی و لەنیوەشەودا کە خەوتبوو کوژرا، لەهەمان کاتدا بنەماڵەیەکی نوێ

---

[1] - الحروب العثمانية الفارسية وأثرها في انحسار المد الإسلامي عن أوروبا، محمد عبداللطيف مريدي، ط١، القاهرة: دار الصحوة للنشر والتوزيع، ص٢٤٧و ٢٤٨.

لەباشووری ئێران دەرکەوت بەناوی(کەریم خانی زەند)، ئەمیش بۆئەوەی فەرمانڕەوایی بۆ خۆی بڕەخسێنێ هەوڵیدا هەندێ کەسی پاشماوەی بنەماڵەی سەفەوییەت بەکارببات، بۆیە نەوەیەکی سوڵتان حوسێنی بەناوی ئیسماعیلی سێیەم لەئەسفەهاندا بەشایەکی نوێ ڕاگەیاند، پاشان لەئەسفەهاندا دووری خستەوە تاوەکو دەسەڵات بۆ خۆی یەکلابێتەوە.

هەروەها چەند کەسێکی تر دەرکەوتن بانگەشەیان دەکرد کە سەر بەبنەماڵەی سەفەوییەتن، بەمەبەستی گەیشتنە دەسەڵات و گەڕانەوەی دەسەڵاتی سەفەوییەت، بەڵام ڕووداوەکان بەردەوام بوون بۆ بەیەکجارەکی کۆتاییهاتنی ئەو بنەماڵەیە، دەسەڵاتی ڕاستەقینەی ئەوکاتی ئێران لەنێوان زەندو ئەفشارەکان دابەش کرابوو، تاوەکو دواتر گوازرایەوە بۆ قاجارییەکان[1].

[1] - صفويه از ظهور تا زوال(الصفوية من الظهور إلى الزوال)، رسول جعفريان،منشورات: مؤسسه فرهنكي دانش وانديشه معاصر، طهران، الطبعة الأولى، ١٩٩٩م.

دوای لێبوونەوە لەخوێندنەوەی ئەم کتێبە، خوێنەر سەرسام دەبێت بەو زیادەڕۆیی و توندڕەوییە مەزهەبییەی کە لەبەر هۆکار گەلێکی سیاسیی روویداوە، بەجۆرێك سوڵتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی، فەرمانی داوە بۆ کوشتنیان شیعەکان سەرژمێریی بکەن و مەزهەبی حەنەفییەت تاکە مەزهەبی فەرمیی دەوڵەت بێ، لەلایەن خۆیشییەوە شا عەباسی یەکەمی سەفەوی، لەداگیرکردنی بەغدا لەسەدەی شانزەی زایین/دەی کۆچی، فەرمانی داوە پاکتاوی ئەهلی سوننە بکرێ و گۆڕی زاناو پێشەواکانیان لەبەغدا وێران بکرێ و دەمارگیری شیعەگەریی راگەیاند و شتی وەهای داهێنا لەمەزهەبی شیعەدا بوونی نەبوو لەکردنی هەندێ کاردا کە بۆ سوڵتان بەسوودو بۆ مەزهەبی شیعە زیانبەخش بوو: رایگەیاند کە دەبێ جنێو بەسێ خەلیفەکە بدرێت(ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان)، وتنی(أشهد أن عليا ولي الله) لەبانگدا کە لەبناغەدا لەبانگدانی لای شیعە نەبوو، زیادکردنی هەندێ ئەفسانەو شتی بێ بنەما بۆ پاڵ تەعزێبارییکردن بۆ حوسێن لەسرووتی عاشورادا.





لە بلاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما